حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٣٦٦)

# عەقڵ گەرایی

عومەر میراوەدەلی

سلێمانی
٢٠٠٥

**عەقڵ گەرایی**

نووسینی: عومەر میراودەلی

بابەت: لێکۆڵینەوە

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: مەهدی ئەحمەد

هەڵەبڕی: نووسەر

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتح

نەخشەسازی بەرگ: دیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی روون

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (٦٧٦)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

www.roshnbiri . org

# سەرەتايەك

لـە كلتـوری ئێمـەدا ئەوەنـدەی قسـە لەسـەر ئـەو دەق و گوتەزايانـە كراوەو گوتراونەوەو لە بەر كراون، ئەوەندە قسە لەسەر بەعەقلانيبوونی ئەو دەق و گوتەزايانە نەكراوە. ئەو گوتەزاو قسانەی لـە مێـژووی ئێمـەدا بەبێ دەستكاری كردن و تێپەڕاندن ماونەتەوە، شايستەی قسـە لـە سـەر كـردن و تێپەڕانـدنن. ئەگـەر كەسـێكيش، قسـەيەكی كردبـێ و خـاوەنی گوتارێكی ديكە بووبێ جيا لەو گوتارە باوەی لە مێژوودا بەبێ دەستكاری كردن ماوەتـەوە، كـەوا ڕووانـين و بۆچـونەكەی بـەبێ پشـتگيری كردنـی گوتەو بيروڕاكانی پێش خۆی نەبووە. كـەمتر لـەكلتوری ئێمـەدا كەسـێك قسەيەكی كردووە، بيرو ڕايەكی دەربڕيوە، سـێبەرو هـەژموونی بـيرو ڕاو ڕوانينـی پـێش خـۆی بەسـەرەوە نـەبووبێ. ئەمـە تـەنيا بـواری فكـری نەگرتۆتەوە، بەڵكوو هونەرو ئـەدەبيش ڕووبـەڕووی ئـەم گرفتـە بۆتـەوە. كاتێك پێناسـەی ئـەدەب و هونـەر كـراوەو پرۆسـەی داهێنـانی ئـەدەبی و هونەری هەڵسەنگێنراوە، بەشێوەيەكی ديارو بەرچاو، چەندين پێناسـەی دووبارەبۆوەو باو گوتراونەتەوە. گوتاری باڵا دەست لەلای ئێمە زياتر ئەو گوتارە بووە كەهەستو سۆزو لايەنی هەستی (الحسي) مرۆڤ دەجوڵێنن، ئەمـەش زيـاتر پەيوەنـدی بـەو هـەڵو مـەرج و بارودۆخـە سياسـی و كۆمەڵايەتی و ئابوورييەوە هەبووە، كـە ڕۆڵـی ديـوە لـە فورمەڵـە بـوون و گەشـەكردنی ئـەم جـۆرە گوتـارەدا. چ گوتـاری ئـاينی، ئـەدەبی، نەتەوايەتی و نيشتمانی، بەرەنجامی ئەم هەڵو مەرج و بارودۆخانە بووە. بۆيـە كـەمتر عەقلانيـەت و ڕەخنـە ئامـادەيی هـەبووەو ئـەم گوتارانـە نەخراونەتـە ژێـر پرسـيارو لـە چـوار چێوەيەكی عـەقلانی و ململانـێ ی فيكـری و عـەقڵی تەندروسـتدا گەشـەی نـەكردووە. ئەگـەر ڕۆشـنگەری

لەلایەك گومانی لەو عەقڵە باوو بیرو بۆچوونە سەپاوو دوگماییانەی سەردەمی خۆی کردبێ‌و یەکێك لەکارەکانی ئەوە بووبێ هەوڵی تێپەڕاندنیانی دابێ، ئەوا بەدیوێکی دیکەدا متمانەو دڵنیایی بەرانبەر بەعەقڵ، بوو بەهۆی دووبارە بوونەوەی هەمان حاڵەتی پێش ڕۆشنگەری. ئەگەر پێش ڕۆشنگەری بیرو بۆچوون‌و ڕوانینە خەیاڵپڵاوییەکان(الوهم) مرۆڤیان دووچاری چەقبەستن‌و دوگمایی کردبێ، ئەوا ئەم جارە بەرانبەر بە عەقڵ ئەم پرۆسەیە دووبارەبۆوە. ئەگەر پێش ڕۆشنگەری بواری کارو چالاکی عەقڵ لە سنورێکی تەسکدا هێڵرابێتەوە، ئەوا لەقۆناغی ڕۆشنگەری دا عەقڵ بواری بۆ کارو چالاکییەکانی دەرەوەی عەقڵ تەسك کردەوە. ڕۆشنگەری ئەو شوێنگەیەی بە عەقڵ بەخشی کە پێی وابوو، تەنیا لەڕێگەی عەقڵەوەو بەبێ هیچ هێزێکی دیکە دەتوانێ جیهان بخوێنێتەوەو نهێنییەکانی بوون‌و ژیان ئاشکرا بکا. ڕۆشنگەری پێویستی بەو گومانە هەبوو، کە لە بەرانبەر یاسا باوو بیروبۆچونەکانی پێش ڕۆشنگەری بەکاری دێنا.

گومان ئەو میکانیزمەیە کە مرۆڤ دەگەیەنێتە ڕاستی‌و بەدیوێکی دیکەشدا بەرەو هەڵەی دەبا. هەندێ جار مرۆڤ ئەنجامی دڵنیایی‌و دوور لە گومان کردن، بۆچوونە هەڵەو ئەفسانەکان، وەك ڕاستیەك قبوڵ دەکاو بەپێچەوانەشەوە، گومان‌والەمرۆڤ دەکا بڕوا بەڕاو بۆچوونی ڕاست نەکاو بە پێچەوانەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکا. گومان لەلای دیکارت ئەو پێدراوە بوو کە بنچینەی فکری خۆی لەسەر داڕشت. ئەو لاپەڕانەی مێژوو کەم نین کە باسی ئەو ململانێیانەمان بۆ دەکەن، کە لەنێوان ئەولەی خاوەنی عەقڵییەتێکی دوگما بوون‌و گومانیان لەو ڕاستیانەکردووە کە بە بەڵگە ڕاستیەکانیان سە لمێنراوەو ئەوانەی

هەلگری ئەو بەلگە سەلمێنرانە بوون. وەك چۆن بیرمەندو فەیلەسوفان لە لێکدانەوەی سروشتو دەوروبەرو بوون بەگشتی ڕووبەڕوی هەڵەو لێکدانەوەی جۆراو جۆر بوونەوە، بەهەمان شێوە هەڵسەنگاندنو لێکدانەوەی دەقەکانی ئایینیش، بەدەرنین لە هەڵەو خوێندنەوەی جۆراو جۆر. هەلو مەرجو بارودۆخی دژوارو سەختی کوردستان بەتایبەتیو عێراق بەگشتی، کارێکیوای کرد، کەنوسینو بابەتی فیکریو فەلسەفی پانتایەکی کەمیان بەربکەوێ. ئەمەش بواری بۆ گوتاری شیعریی ڕەخساند کە ببێتە گوتاری زاڵی ناو ڕۆشنبیری ئێمە. ڕۆشنبیرو خوێنەری کورد جگە لەزمانی کوردی زمانی عەرەبی سەرچاوەیەکی دیکە بووە بۆ فێربوونو شارەزا بوون لە فەرهەنگو ڕۆشنبیری گەلانی دیکە، لە عیراقی بەعسیشدا بەهۆی ئەو دەرگا داخراوییەی سەردەمی ڕژێمی بەعس نەك خوێنەرو ڕۆشنبیری کورد، بەڵکو خوێنەرو ڕۆشنبیری عەرەبیش لە زۆربەی بزافە فکریو فەلسەفیو ئەدەبیو هونەرییەکانی جیهان بێ ئاگابوو، کارو چالاکیو بیرو بۆچوونی بیرمەندو فەیلەسوفان، بە هۆی ئەو بارودۆخە ناهەموارو سەختە، درەنگ گەیشتنە وولاتی ئێمە. لەدوای ڕاپەڕینەوە بزاوتێکی فیکریوفەلسەفی لە کوردستان بەهەوڵی کۆمەڵێکیوەك (ڕەهەند)و(ژیان)دەستی پێکرد. هەریەك لەو هەولانە بانگەشەی گوتارێکیان کرد، کەبووە هۆی جۆرەدابڕانێك لە گوتاری پێش خۆی، کەلەگوتارێکی شیعریو سۆزگەراییدا بەرجەستەبووبوو. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کەگوتاری شیعریو سۆز پێویست نەبێ، بەڵکو مەبەست لەوەیە کە گوتارێك ئەوەندە باڵا دەست دەبێ، بوارێکیواناهێڵێتەوە گوتارەکانی دیکە بێنە قسە.

## سروشتی عەقڵ

هەر لەوکاتەوە، کەمرۆڤ لەو سەرزەوییەدا، ئەرکی جێ نیشینایەتی پێسپێرراوە، لە بەرامبەر ژینگەو دەوروبەرو گۆڕانکاریە سروشتییەکاندا، دووچـاری تێڕامـانو بیرکردنـەوەو هەڵوێسـتی جۆرلوجـۆر بـووەو بـەدوای وەڵامی پرسـیارە چـارەنووس سـازەکاندا گـەڕاوە. ئەوەندەی وەڵامـەکان مرۆڤـی ڕووبـەڕوی کێشـەو گرفـت کردۆتـەوە، ئەوەنـدە پرسـیارەکان نەبوونەتـە گرفـتو کۆسـپ، چـونکە سروشـتی پرسیار ئەوەندە ئاڵۆزو پڕ کێشەوگرفت نییە، وەك ئەوەندەی وەڵامەکان مایـەی مشـتو مـڕو لێـدوانو ململانێـی نێـوان بـیروڕاو فەیلەسـوفان بەتایبـەتیو کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی بەگشـتی بـووە. توانـاو دەسـەڵاتو عەقڵو ئاستی هۆشیاری دەست نیشـانی سنووری وەڵامەکانی کـردووە. کاتێـك مـرۆڤ لەپشـت بەسـتن بەعـەقڵیش، بـۆوەڵامی هەنـدێك پرسـیار کەوتۆتـە گومانـەوە، وێکـڕای عـەقڵ خـەیاڵو ئەفسـانەش ڕۆڵـی دیـارو ئاشکرایان، بۆوەڵامی پرسیارەکان دیوە. واڵابـونی دەلاقـەیی ئەفسـانەو خەیاڵ بەرەنجامی دەستەو ستانی ئەقڵی مرۆڤ بووە، لەبەرامبـەروەڵامی هەنـدێك لەوپرسـیارانەدا. ئەمـەش تینـوێتی مرۆڤـی بەدرێـژایی مێـژوو بۆدۆزینەوەو گەیشتن بەوەڵامەکان دەرخستووە.

دیارەوەڵامـەکانیش بەئەنـدازەی شـارەزاییو ئاسـتی هۆشـیاری کەسەکان لێکدی جیان. وەڵامی زۆربەجیایە لەوەڵامی ئەو چینە دەستە بژێر (النخبة) یەی کەهەروا بە زوویيو بێ تێڕامان،وەڵامـی نەداوەتـەوەو رەهەندە نادیارو شارەوەکانی پرسیاری دەست نیشـان کردوەووەڵامـی جۆراوجـۆری بۆپرسـیارەکان خسـتۆتە ڕوو. ململانێـی نێـوان بیریـارو فەیلەسـوفان پانتایی وەڵامـەکانی فـراوانتر کـردووەو بووەتـە هـۆی

سەرهەڵدانی چەندین قوتابخانەو رێبازی فەلسەفیو فیکری جۆراو جۆر. مرۆڤویـرای هەوڵـدانی بـۆ گـۆڕینی ڕووی ئەسـتوو(مـاددی) ژیـانیو خزمـەتکردنی جەسـتەی، هـەوڵی داوە عـەقڵوروزەو تواناکـانی دیکـەش بخاتە کارو لە پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەو جێ بەجێ کردنـی ئـەرکی جـێ نشینایەتیدا لەسەر زەوی بەکاری بێنێ. دوالیزمـی جەسـتە/ عـەقڵ ئـەو دوالیزمەن کەلەگەڵ ئەوەشدا، چالاکی هەر یەکێکیان لەوی دیکە جیایـە، پەیوەندییەکی بەردەوامیان بەیەکەوە هەیـە. چالاکییەجەستەییەکانیش لـە ڕێگـەی عەقڵـەوە ئاراسـتە دەکـرێن، جگـە لەوچـالاکییانەی کـە ناهۆشـیارینو دوور لـەئیرادەی مـرۆڤ ئـەنجام دەدرێـن. مـرۆڤ ئـەم دروستکراوەی خودایـە، کـە دەیـەوێ لـەم دیـوی نهێنیـەکی ئاشـکراکراو بچێتە ئەودیوی نهێنیەکی دیکەو ئەم حەزی گەڕان بەدوای نهێنیو نادیار لەچـەندین شـێوازی جۆراوجـۆردا بەرجەسـتە دەکـا. گـەڕان بـەدوای نهێنیونادیارو دڵنیانـەبوونی بەهـەموووەلامێکو چـەکەرەکردنی پرسـیار لـەدوای پرسـیار لـەقووڵایی هەسـتو ئەسـتیدا، بەشـێکە لەسروشـتی مرۆییانەو پێکهاتەیو هەوڵدانێکە بۆسەلماندنی بوونی خۆی. هەندێ جار مـاڵو سـامان دەبێتـە ئـەو نهێنییـەی کـە دەبـێ ئاشـکرا بکـرێ، دوایـی لەدەلاقەو پەنجەرەیەکی دیکەوە دەڕوانێو لە ئاسـۆیەکی نادیـارەوە بـۆ ئاسۆیەکی دیکەی نادیار دەگەڕێو بەردەوام پەنجەرەکان دەکاتەوەوواز لـە رامـانو بیرکردنـەوەو گـەڕان نـاهێنێ. لـەودیوی هـەر بینراوێـك بـۆ نـەبینراوێك دەگـەڕێو بەڕێگـەی ئەفسانەداوێڵی جیهـانی نادیار دەبـێو دەیەوێلــــەم جیهانــــە ئەفســــوناوییەدا، گەشــــتێك بــــەنێو خەونەوەدینەهاتووەکانیدا بکات. لەباوەش کردنی بە هوونەرو ئەدەبدا، جارێکی دیکە، گوزارشت کـردن لـەو حـەزە بەرجەسـتە دەبـێ. ئـاینیش

بەشێکە لەو خواستەی مرۆڤ کەدەیەوێ بەهۆیەوە جیهانێکی دیکە لەم دیو ئەم جیهانە بینراوو هەست پێکراوە بدۆزێتەوە. خەونی نادیار ئەو پرسیارەیە، کەبەردەوام مرۆڤ لە هەر قۆناغو بارو دۆخو ئاستێکی هۆشیاریدابێ کردوویەتی. عەلی عیزەت بیگوفیچ دەڵێ ((بۆئەوەی ڕەگو ڕیشاڵی هونەر لەناو ئاییندا بدۆزینەوە، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ چاخەکانی پێش مێژوو، ئەو کاتە ئەو ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێ کەئاینو هونەرو ڕەوشتە سەرەتاییەکان یەك سەرچاوەیان هەیە، ئەویش بریتیە لەئارەزووی مرۆڤ بۆ جیهانێکی نادیار))[1].

(کانت) لەو بڕوایەدابوو، کە گەیشتن بەڕاستییەکانی ئایین لەڕێگەی عەقڵی ڕووتەوە، پرۆسەیەکی ناتەواوەو عەقڵو میتافیزیك نابێ بەیەکەوە باس بکرێن، بواری عەقڵو میتافیزیك لەیەکدی جیان، کانت پێی وابوو کەدەکرێو دەشێ باسی خوداو ئازادیو نەمری بکرێ، بەڵام ئەم باسانە، دوور لەچوارچێوەی پێویستییەکانی بوونەوە، مرۆڤ دوچاریگومراییو سەر لێ شێوان دەکەن[2]. مرۆڤوەك چۆن لەڕێگەی عەقڵەوە، ئەو ژینگەو دەوروبەرەی ناسیوەکەتێیدا ژیاوەو جیهانی بینراوی لێکدلوەتەوەو بەپێی ئاستی گەشەی عەقڵو هۆشیاری، لەو چوارچێوەیەدا، چەندین بیرو بۆچوونو هەوڵی بۆلێکدانەوەی ژیانو بوون پێشکەش کردووە، بەهەمان شێوە سنووری ئەم جیهانە بینراوەشی بەزاندووەوویستوویەتی لەجیهانی نادیاریش بگا. لەپاڵ ئاییندا کە، بەشێکی جیهانی نادیاری بەهۆی نێرراوەکانی خودلوە بۆمرۆڤ ئاشکرا کردووە، فەیلەسوفو بیریارانیش قسەیان لەو جیهانە نادیارە کردووە. ئەوەی لەپانتایی مێژووی مرۆڤایەتیدا، زیاتربووەتە هۆی ململانێی نێوان بیریارو فەیلەسوفانو هەڵگرانی پەیامی خودایی، لایەنی نادیار بووە، چ

نێرراوانی خوداو چ فەیلەسوفو بیریاران ڕووبەڕووی ئەو پرسیارانە بوونەتەوە، کە خەڵك لەنادیار کردوویەتی. هەندێك لەولایەنانەنادیارانەلەگەڵ گەشەی فیکرو فەلسەفەو بەرەو پێشەوەچوونی کۆمەڵگەو گۆڕانی عەقڵو هۆشیاری زیاتری مرۆڤ ئاشکرابوونو هەندێکیشیان تەنانەت نێراوەکانی خوداشوەلامیان پێ نەبووە. ئەگەر لەقۆناغو سەردەمێکی دیاری کراوی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی داو بەرەنجامی ناهۆشیاریو سستی ڕەوتی عەقلگەرایی، هەندێك لەوپرسیارانەی کەمرۆڤ دەربارەی ژیانو بوون کردوویەتیو لەبازنەی نادیاردا ماونەتەوە، ئەوا لەقۆناغو سەردەمی دواتردا دوای ئەو گەشەو جمو جۆڵو چالاکییە بەرچاوەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەچوارچێوەو شێوەی جۆراوجۆری بزاوتی عەقلگەراییو فیکریو ژیاریو شارستانێتی بەخۆیەوەدی، زۆربەی ئەو نادیارانە لەبەرگی پێواریو نادیاری دا نەماوەتەوەو ئاشکرابوون. نادیاری دوێنێ بووە بەدیاری ئەمڕۆ. بەشێك لەو پرسیارانەی دوێنێ، بێوەلام بوون، ئەمڕۆ وەلام دراونەتەوە. ئەگەر مرۆڤ هەوڵی دابێ خۆی لەوەلامی پرسیارەکان نەدزێتەوەو بۆ هەر پرسیارێكوەلامی جۆراو جۆری درابێتەوە، ئەوا هەڵبژاردنیوەلامی ڕاست، ئەو دووڕیانە بووە، کە مرۆڤی ڕووبەڕووی ڕامانو بیرکردنەوە کردۆتەوە. کاتێك مرۆڤ هەوڵی داوە لە نهێنیەکانی ژیانو بوونو سروشت بگا، گومانی لە عەقڵو هەنگاوەکانی خۆی هەبووە، لەم پرۆسەی دۆزینەوەی نهێنیانەو ئاشکراکردنی نادیارانەدا. ئەم گومانو ڕاڕاییە سەرەتاو دەسپێکێکی کاریگەر بووە، بۆ ئەوەی زیاتربە قوڵاییو دیاردە نهێنیەکاندا ڕۆبچێو هەرزوو باوەڕی نەکردووە، ئەم باوەڕنەکردنو گومانە عەقڵی چالاکتر کردووەو سەروەرێتی ئەوەی

پێ بەخشراوە، کە بتوانێ پرۆسەی هەڵاوێردن و لێکدی جیاکردنەوەی ڕاست و هەڵە بەئەنجام بگەیەنێ. لێرەوە مرۆڤ لە گومانەوە بەرەو ڕاستی و دڵنیایی هەنگاوی ناوە. (دیکارت) یەکێك بوو لەو فەیلەسوفانەی کەلەگومانەوە دەستی پێ کردووە. گومان لەعەقڵ گومان لەهەستەوەرەکان، چونکە بەڕای دیکارت ئەو زانیارییەی لەڕێگەی هەستەکانمانەوە دەستمان دەکەوێ جێگەی گومانەو بەهەمان شێوە عەقڵی مرۆڤیش، مرۆڤ ڕووبەڕووی هەڵەدەکاتەوە. ئەوەی دیکارت گومانی لێی نەبوو، ئەو کەسە بووە کە گومانی هەیە، بۆیە گەیشتە ئەو بیرۆکەیەی کە گومانێ لەوە نەبێ کە هەیە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بە گوتە بەناوبانگەکەی بناسرێ کە دەڵێ (( من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم ))[٦].

هەر یەکێك لە پێنج هەستەکان و عەقڵ و غەریزە، سەرچاوەی زانین و مەعریفەی مرۆڤن و بەهۆیانەوە مرۆڤ توانیویەتی خۆی و ژینگەو دەوروبەرو گەردون بناسێ و لەدیاردەو نهێنیەکانی سروشت ورد بۆتەوە. ئەو سروشت و زگماکەی کە مرۆڤی لە سەر دروست کراوە، هەروەك خودا لە قورئاندا باسی دەکا سەرچاوەیەکی دیکەی ناسینی بوون و گەیشتنە بەدڵنیایی و ڕاستییەکان. زۆر جار مرۆڤ لە ئەنجامی بەراورد کردنی عەقڵ و جیهانی دەرەوەدا دەکەوێتە هەڵەوە، چونکەوەك دیکارت بۆی دەچێ، هەر تەنها جیهانی دەرەوەی مرۆڤ سەرچاوەی زانین نییە، بۆیە پێویستە مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەیەکی دیکە، تاکو زانین و مەعریفەوەدەست بێنێ، ئەو سەرچاوەیش سروشت و زگماکە. ئەمەش نەك سەرچاوەیەکەو بەس، بەڵکو بەرای دیکارت لەو سەرچاوەیە چاکترە کە مرۆڤ لەدەرەوەوەدەستی دێنێ " چونکە بۆ گەیشتن بەزانین و

مەعریفە دەست پێکردن لەناوەوە بۆدەرەوە چاکترە لەدەرەوە بۆ ناوەوە. بۆیە دیکارت بڕوا هێنان بە خۆمان، یان بەواتایەکی دیکە دڵنیابیمان لەوەی کەبیردەکەینەوە کەواتە هەین و بڕوا هێنانمان بەخودا ڕاستی حاشا هەڵنەگرن، چونکە لە سروشت و زگماکەوە سەرچاوەیان گرتووە[1]. زۆر جار مرۆڤ دوای بیرکردنەوەو تێرامان دەگاتە ئەو بەرەنجامەی کە بڕوا بەهەندێك لە ڕاستیەکان بێنێ، ئەمەش زیاتر کاری بیریارو فەیلەسوفانە. هەر هەمان ئەو ڕاستیانەی کە لەلایەن ئەو بیریارو فەیلەسوفانەوە دوای رامان وبیرکردنەوە بڕوایان پێ دەهێندرێ، ئەوا خەڵکی دیکە دوور لە تێرامان و بیر کردنەوەی بیریارو فەیلەسوفان بە هۆی سروشت و زگماکەوە بڕوایان پێ دێنن و ڕاستی بونیان دەسەلمێنن. لێرەدا مەبەست لەوە نییە کە بیرکردنەوەو تێرامان تایبەت بێ بە هەندێك کەس و لەوانە بیریارو فەیلەسوفان و سروشت و زگماکیش تایبەت بێ بە هەندێکی دیکە. هەموو مرۆڤێك خاوەنی ڕامان و بیرکردنەوەو سروشت و زگماکیشە، بەلام جیاوازییەکە لەوەدایە، کە هەندێك لەو بیرو فەیلەسوفانە لەئەنجامی پشت بەستنی زیاتریان بە عەقڵ و تێرامانەوە سروشت و زگماك پشت گوێ دەخەن. هەرچەندە ئەو سروشت و زگماکە زۆر جار بەئاگا دێت و ئەو کاتە لەگەڵ عەقڵدا ئاشت دەبێتەوە. بۆیە زۆر لەو بیرو فەیلەسوفانەی بەدرێژایی مێژوو، دوای ئەوەی لەرێگەی عەقڵەوە نەگەیشتوونەتە، هەندێك ڕاستییەکان ئەوا بەهۆی بە ئاگاهاتنی سروشت و زگماکیانەوە، هەستیان بەهەڵەکانی عەقڵ کردووەو بڕوایان بەخوداو ڕاستییە نادیارەکان کردووە.

عەقڵ ئەو پانتاییەی لەژیانی مرۆڤ دا داگیر کردووە، کە ڕۆڵی بۆ ناسین و دۆزینەوەی نهێنیەکانی سروشت و نۆزینەوەو داهێنانەکان

لـەبواری زانسـتو زانیـاریو ئەسـتوودا گرتۆتـەوە. چـونکە دۆزینـەوە زانستیەکانو پەی بردن بە نهێنیەکانی سروشت ئەوەندەی کاری عەقڵە، ئەوەنـدە کـاری سروشـتو زگمـاك نییـە. وەنـەبێ لێـرەدا بمانـەوێ دۆزینەوەکانی بواری زانستو زانیاری بەعەقڵ بسپێرینو نادیارەکـان بـە سروشتو زگماکی مرۆڤ. چونکە لەقورئاندا چەندین ئایەت هەن کە مـرۆڤ هانـدەدەن بـۆ ئـەوەی لەرێگـەی عەقڵـەوە، خـودا بناسـێ، بـەڵام جگـە لەعـەقڵ مـرۆڤ خـاوەنی ئـەو سروشـتو زگماکەیەکـە بەهۆیـەوە خـودا دەناسێو بڕوا دێنێ. ئەرکی عەقڵوەك چۆن دۆزینـەوەو پـەی بردنـە بـە نهێنیەکانی سروشتو لێکدانـەوەی دیاردەکـان، بەهـەمان شـێوەش ئـەو ئەرکـەدەبینێ کـە خـودا بناسـێ. ئـەركو ڕۆڵـی عـەقڵ لـەژیانی مرۆڤـدا، تایبەت نییە بە سەردەمو کاتو شوێنێکەوە، بەڵام دەشێ بگوترێ عەقڵ لــە ســەردەمو قۆناغێکــدا جیایــە لەســەردەم قۆنــاغێکی دیکــەو دەرەنجامەکانی عەقڵ لە قۆناغو سەردەمەکانداجیاوازییان هەیە. عەقڵی تـاکو کـۆ کاریگـەریان لەسـەریەکدی هەیـە. فەیلەسـوفـو بیریـاران ئـەو تاکانەن کە کاریان لە عەقڵی کۆو زۆربـە کـردووەو عـەقڵی ئـەمان کـەمتر کـاری لــە عــەقڵی بیریـارو فەیلەسـوفان کـردووە،چـونکە بـیر یـارو فەیلەســوفان خــاوەنی ڕوانــینو بۆچــوونی تایبــەتی خۆیــانن‌و ئــەو ڕاوبۆچـوونانەیان هەنـدێك جـار لەگـەڵ ڕای گشـتی کۆمەڵگـەدا دژایـەتی نییــەو زۆر جــاریش دژایــەتی هەیەوبەپێچــەوانەوەیە. ئەگــەر بیریــارو فەیلەسوفان بـڕواو ڕوانینیـان لەگـەڵ ڕوانـینو بۆچـوونی کۆمەڵگـەداوەك یەك بێو لەهەندێك بابەتدا هاو ڕابن ئەوا شێوازی دەربڕینی هەریەکێکیان لێکدی جیایە. پەیوەنـدی نێـوان عـەقڵو میتافیزیـك لـەلای فەیلەسـوفـو بیریـارانی ئیسـلامی مایــەی مشــتومڕو گفتوگۆبــووە. (محەمەدعابـد

ئەلجابری) باسی هەڵوێستی فیکری لێك جیای هەریەك لەفارابی‌و ئیبن روشدو ئیبن سیناو ئیبن خەلدون دەکا[٥]. بیریارانی ئیسلامی بەکەڵكوەرگرتن لەفەیلەسوفە یۆنانیەکان،هەریەك لە ئەرستۆو ئەفلاتون، بوونە خاوەنی چەندین قوتابخانەیفیکری‌و عەقڵگەرایی. لەهەر قۆناغ‌و سەردەمێکدا،موسڵمانان لەبەرامبەر بیرو بۆچوون‌و تێزە فکری‌وفەلسەفییەکانی بەرامبەردا بوونەتە دوو بەش، هەندێکیان ڕەتیان کردوونەتەوەو کۆمەڵێکیشیان‌وەریان گرتووەو لەگەڵ پاراستنی بنەماکانی ئیسلام دەرگایان لەڕووی ئەو بیروبۆچوونە، فەلسەفی‌و فیکرییانەدا دانەخستووە.[٦] زۆر جار ئەم دەرگا داخستنە ئەك لەقازانجی بزاوتی فیکری ئیسلامیدا نەبووە،بەڵکو زیانی لێداوە:چونکە ئەگەر لەسەردەم‌و ڕۆژگارێکدا دەرگا لەڕووی بیرو بۆچوونی بەرامبەردا داخرابێ، ئەوا لەسەردەم‌و بارودۆخێکی دیکەو لەدەرگاو دەلاقەیەکی دیکەوە، ئەو فیکرە دزەی کردووەو هاتۆتە ناوەوە. هەڵوێست‌و بۆچوونی ئەورووپییەکان بەرامبەر بەفەلسەفەی یۆنانیەکان جیابووە لەهەڵوێستی موسڵمانان، جۆری کەڵكوەرگرتن‌و ڕەتکردنەوەی هەریەك لە ئەورووپی‌و گەلانی موسڵمان لێك جیایە. جابری پێی وایە، کەئەورووپییەکان ئەرستۆو ئەفلاتونیان لەپێناوی بەهێزکردنی مەعریفەداوەرگرت، بەلام عەرەبە موسڵمانەکان بۆ مەبەستی بەهێز کردن یان خزمەتکردنی ئایدولۆژیاوەریان گرت. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە، دوو قوتابخانەی لێك جیا سەرهەڵبدەن، ئەویش قوتابخانەی (بەغدا) لە خۆرهەلات‌و (قورتوبەو فاس) لە خۆرئاوا.[٧]

هەرکاتێك فەلسەفەو بزاوتە فیکریەکان لە خزمەتی ئایدۆلۆژیادا بوون، ئەوا چەندە ئەو ئایدۆلۆژییایە کەڵك لەو فەلسەفەو تێزە

فیکرییەوەردەگری، ئەوەندەش بۆ بەهێزکردنی پایەکانی خۆی ئەو فەلسەفەو تێزە فیکرییە لە ئەرکو ڕۆڵی تایبەتی خۆی دوور دەکەوێتەوە، بارودۆخی سیاسیو ئابووریو ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵایەتیو ژیاری هەر نەتەوەیەك، ڕۆڵی دیارو بەرچاوی هەیە لەوەرگرتنو ڕەتکردنەوەی هەریەرو بۆچوونوتێزێکدا. ئەمەنەك تەنیا لەسەر ئاستی گەلو نەتەوە، بەڵکو لەسەر ئاستی تاکیش ئەم جیاوازییە هەیە. جیاوازی عەقڵو تێڕوانینو بۆچوونی مرۆڤ لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمو قۆناغێکی دیکەکارێکیوای کردووە، کە بەردەوام بیریارو فەیلەسەفان خوێندنەوەی جیاجیان هەبێت بۆ تێزو فیکرو بیرۆکەی پێش خۆیان، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە بەردەوام لەهەرسەردەمو قۆناغێکی مێژووییدا، جۆرە خوێندنەوەیەك بۆ فەلسەفەی یۆنانییەکان هەبێت. ڕۆڵو کاریگەری فەلسەفەی یۆنانییەکان لەسەر هەریەك لە ئەوروپاوولاتانی ئیسلامی جیابووە. ئەوروپییەکان بەدیدگایەکو موسڵمانیش بە دیدگایەکی دیکەوە سەیری ئەو سامانە فەلسەفیو فیکرییەیان کردووە. ئاستی ڕۆشنبیریو ئەو بارودۆخە سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتییەی کە هەر گەلو نەتەوەیەك تێیدا دەژی، ڕۆڵی هەیە لەوەرگرتن یان ڕەتکردنەوەی هەر بیروبۆچوونو تێزێکدا. بونیادی عەقڵیو فیکری یۆنانییەکان لەسەر دوالیزمی مرۆڤ /گەردوون،بەندبووە، کەئەمەش جیابووە لەو لۆژیکوبونیادەی عەقڵی ئیسلامی کاری لەسەر کردووە. لوژیکوبونیادی عەقڵی ئیسلامی لەسیانەی (خودا، مرۆڤ، گەردوون) پێك دێ، ئەم حاڵەتە لای یونانیەکان زیاتر لەدوالیزمی (مرۆڤ/ سروشت)دا بەرجەستە بووە[٨].

سەرەتاو دەستپێکی جیاوازییەکە لەو بنەما سەرەکییەوەیە، کە هەڵوێستو تێڕوانینی مرۆڤ لەبەرامبەر ئەم گەردوونو سروشتو ژینگەیە دەردەخا. پرسیاری سەرەکیو چارەنووس ساز کەپەیوەندی بەژیانو داهاتووی مرۆڤو مردنو زیندووبونەوەی دوای مردنەوە هەیە، لێرەوە دەست پێدەکا، کەمرۆڤ لەکوێوە هاتووەو چۆن دروست کراوەو سەرەنجامی دوای مردنی چییە؟وەڵامی ئەم پرسیارانە لەلای مرۆڤی بڕوادار بەگشتی، جێگیرەو ئەمەش خاڵی جیاکەرەوەی نێوان فەلسەفەی یونانیەکانو موسڵمانان بووە. بۆیە بیریارو فەیلەسوفانی ئیسلامی، کاتێك بەفەلسەفەو ڕوانینی یونانیەکان سەرسام بوونو لێکدانەوەو گفتوگۆیان لەسەر دەکرد، هەریەکێك لەو بیریارە ئیسلامیانە بەدرێژایی مێژوو لەئاست ئەو خاڵەدا خاوەنی یەك هەڵوێست بوون. جیاوەزییەکە لەو لایەنەوە بووەو بەردەوام ئەم لایەنە دووبارە دەبێتەوە، کەتایبەتە بەو تێڕوانینو بیروبۆچوونانەی کە دەگۆڕێنو جێگیرنینو ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش لایەنی گۆڕاوو نەگۆڕاوی ڕوون کردۆتەوە. مرۆڤ هەرلەوکاتەوە کەخۆی لەم سەرزەوییە دیوەو ئەرکی جێ نشینانەیەتی پێ سپێرراوە، وزەو تواناکانی خۆی بۆ دۆزینەوەی نهێنیەکانی ئەم سروشتو ژینگەیە بەکارهێناوە، کەتێیدا ژیاوە. هەندێك لەو نهێنیو لایەنە نادیارو شاراوانە، دوور لەوزەو تواناو عەقڵی مرۆڤ بوون" بۆیە خودا بەپێغەمبەراندا، سەرچاوەی بوونو وەڵامی ئەو پرسیارانەی بۆ ناردووە، کەپەیوەندییان بەنادیارەوە هەبووە. هەر کاتێك مرۆڤ گوێی بۆ پەیامی پێغەمبەران نەگرتبێو بڕوای پێ نەهێنابێ، ئەوا بۆ دۆزینەوەی ئەم نهێنیو لایەنە شاراوانە بووتە خاوەنی چەندینوەڵامی جۆراو جۆر کەمرۆڤیان نەگەیاندۆتە ئەنجامو ئاکامێکی دڵنیایی بەخشیان نەداوەتێ"

بۆیەوەڵامی ئەم پرسیارە میتافیزیکییانە ئەفسانەو بیرو بۆچوونی هەڵەو دوور لەڕاستییان لەخۆگرتووە. زانایان‌وبیریارانی ئیسلامی لەپاڵ لێکدانەوەو ڕاڤە کردنی دەقەکانی قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە، پرۆژەی فیکری‌و عەقلانییان پێشکەش کردووە، هەر خودی ئەم لێکدانەوەو ڕاڤەکردنە، پرۆسەیەکی عەقڵییە. دەبێ ئەوەش لەبەر چاو بگیرێ کەگەلێك ڕاستی هەیە لەڕێگەی عەقڵەوە پەی پێ نابرێ " ئەمەش مانای ئەوەنییە کەمرۆڤ لەڕێگەی عەقڵەوە ڕاستییە نادیارەکان نادۆزێتەوە. کێشەو تەنگژەی عەقڵ‌و میتافیزیك لەخۆرئاوا بەرەنجامی ئەوەبووە،کەسنووری تخوبی، هەر یەکێك لەو دووانەیان تێکەڵ کرد، سروشتی مرۆڤیش‌ولیە، دەستبەرداری ئەو پرسیارانە نابێ کە پەیوەندیان بەجیهانی نادیارەوە هەیە، فەیلەسوفانی خۆرئاوا لەو لایەنەدا نەگەیشتونەتەوەڵامێك کە دڵنیایان بکا، چونکە بۆ گەیشتن بەوەڵامی ڕاستی ئەو لایەنە پشتیان تەنها بەعەقڵ بەستووە، تەنانەت لەو لایەنەشدا کە کاری عەقڵە، یەك دەنگ نین. مارکس‌و نیتشە کەدوو فەیلەسوفن هەریەکایان لەدیدگایەکی عەقڵی جیاوەزەوە دەڕوانن. ((نیتشە زێدەڕۆترین فەیلەسوفی سەردەمی نوێیە کە دژایەتی مێگەل‌و هاوکاری کۆمەلایەتی دەکا، ئەو میگەلانەی لای ئەو نیشانەن بۆ جەماوەر. هەروەها لەبەرئەوەی بەپێی بۆچوونی نیتشەویستی هێز ئامازەیە بۆ هاتنەدی ئامانجی تاکەکەس لەلای ئەو فەیلەسوفە تا تاکەکەس لە کۆت‌و پەیوەندیی مێگەلدا بێت (هەرچەندە ئەو کۆت‌و پەیوەندە لە خزمەتی بەرژەوەندی گشتیشدا بێت) هەر وەرچەرخانێکی سیاسی ئابووری ڕووبدات، ئەم‌وەرچەرخانە ناتوانێت تەنگو چەڵەمەکانی ژیانی نوێ چارەسەربکات، بەڵکو هەروەك خۆی دەیهێڵێتەوە بەبێ

گۆرانکاری. ئالێرەدا جیاوازی رەگو ریشەیی‌و بنچینەیی نیتشە لەگەڵ (مارکس)دا دەردەکەوێت. لەکاتێکدا فەلسەفەی مارکسی فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی و ئامانجی هێنانەدیی بەرژەوەندییە گشتیەکانە،کەلەخزمەت زۆرینەی خەڵکدایە))[٩].

مرۆڤ تەنها لەعەقڵ‌ولایەنە بینراوەکاندا بەدرێژایی مێژوو لێکدانەوەو بیرورای جیاوازی نییە " بەڵکو کێشەوتەنگژەی مرۆڤ چەند بواری بینراوەکانی گرتۆتەوە، ئەوەندەش لەبواری میتافیزیك و لایەنە نەبینراوەکانی گرتۆتەوە. لەگەڵ دروستکردنی مرۆڤدا پرسیارە میتافیزیکییەکان لەدایك بوون. ئەگەر مرۆڤ لەسەردەم قۆناغێکی مێژووییدا بەهۆی عەقڵەوەچەندین کێشەی چارەسەرکردبن‌و گەلێك نهێنی دۆزیبێتەوەو لەو بوارەدا دڵنیا بووبێ، ئەوا پرسیار لەنادیار هەرکاتێك دوورلە رێنوێنی خودایی بووبێ‌و مرۆڤ لەو بارەوە گوێی بۆ پێغەمبەران نەگرتبێ، ئەوا دووچاری قەیران‌و تەنگژە بووەو نەگەیشتۆتە ئاکام، گەرچی نکۆڵیشی کردبێ و پێی وابووبێ ئەنجامێکی دەستکەوتووە. ئازادحەمە دەڵێ:(( لێرەوە شیاوەوتنی ئەوەی کەدەربازبوون لەچنگ میتافیزیك ئاسان نییەو ئاسانیش نییە بەرهەم هێنانی تێگەیشتن لەمەڕ دیاردەکانی ناو بوون بەبێ میتافیزیك. . . . (١٠). لێرەدا مەبەست لەوە نییە کەپرسیاری میتافیزیك پرسیارێکی عەقڵانی نییە " بەڵکو ئەوەی گرنگە ئەوەیە کەوەڵامی ئەم پرسیارە عەقڵانییە، گەر سەرچاوەکە عەقڵ‌و بیری مرۆڤ بێ، تەنگژەو کێشەی لێدەکەوێتەوە. عەقڵی مرۆڤ سنووردار نەکراوە کەتەنیا بیر لەدیارو بینراوەکان بکاتەوە " بەڵکو عەقڵ بیرکردنەوە لەنادیارەکانیش لە خۆی دەگرێ. ئازادی مرۆڤیش لەوچرکەساتەوە دەست پێناکا کەلەنێوان بروا

هێنان و بیّ بڕواییدا ئازادی پیّ بەخشراوە" بەڵکو دوای هەڵبژاردنی هەریەکێك لەمانە ئازادی بەردەوام دەبیّ. پاڵنو پیرۆزی ئیسلام و ئایینە ئاسمانییەکان بەگشتی پاساوێك نییەبۆ ئەوەی سنووری عەقڵانیەت تەسك بکرێتەوە،وەك لەمێژووی ئیسلامدا بەهۆی جۆرێك لەخوێندنەوە بۆ عەقڵ، چەندین کێشەو قەیران لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا روویاندا. هەروەها لادان و دوورکەوتنەوەی قەشەو پاپاکان لەپەیامی عیسا (سەلامی خودای لیّ بیّ)ئیسان نابێتە پاساوێك کە عەقڵانیەت و عەقلگەرایی، گەرچی چەندین هەنگاوی گرنگی نابیّ وچەندین نهێنی دۆزیبێتەوە،دوورە لەرەخنەو کۆمەڵگەی رووبەرووی قەیران وکێشە نەکردۆتەوە. ((لەئەنجامی کارکردن و گەیشتنی عەقڵ بەگەورەترین سەرکەوتن،ئیهلیزم هاتەکایەوە، کارکردنی عەقڵی کۆمەڵگەی مۆدێرن، توانی هەموو دنیا بەتەکنولۆژیا بکات، پاش ئەم هەموو سەرکەوتنانە ئیهلیزم بەکۆمەڵگەی مۆدێرن بەخشرا. لەراستیدا ئەم دیارییە کۆمەڵگا لەخۆیەوە بەخۆی بەخشی. ))[٦٤]. تەبایی و ناکۆکی نێوان عەقڵ و ئایین، پەیوەندی بەو شێوازە خوێندنەوەو تێگەیشتنەوەوە هەیە،کەخەڵك بەگشتی و بیریارو فەیلەسوفان بەتایبەتی بۆهەریەك لەعەقڵ و ئایین هەیانە. لەم نێوانەش دا دەسەڵات،رۆڵی خۆی دەبینیّ لەدیاری کردن و دەستنیشان کردنی شێوازی پەیوەندییەکە.

## عەقڵ لەنێوان ڕێژەیی و ڕەهاییدا

وەك چۆن هەندێ جا مرۆڤ بەگومانەوە مامەڵەی لەگەڵ عەقڵدا کردووە" لەهەمان کاتداو لەهەندێ حاڵەتیشدا،بڕواو متمانەیەکی لەسنوور بەدەری بەعەقڵ بەخشیوە. ئەگەر حاڵەتی یەکەم چالاکی عەقڵی مرۆڤی زیاترکردبێ‌و مرۆڤی هانداببێ، زیاترپرسیار بکاو تەنها لەڕواڵەتی دیاردەکان ڕانەمێنێ‌و بیر لەودیوی بینراوەکان بکاتەوەو لەدەلاقەی جیاجیاوە بۆدیاردەکان بڕوانێ، ئەوا لەحاڵەتی دووەمدا مرۆڤ بەجۆرێك لەسەرسامی‌و لەخۆباییبوونەوە لەعەقڵی خۆی ڕوانیوە. پرۆسەی عەقڵانییەت لەیەك شێوازو میکانیزمدا خۆی نابینێتەوەو سەردەم‌وبارودۆخی سیاسی‌و ئابووری‌و ئاستی گەشەی کۆمەڵگەو جیاوازی ئاستی تێگەیشتنی مرۆڤ، سەرهەڵدانی چەندین قوتابخانەو تێزو بۆچوونی جیاجیای بەدواداهاتووە. ئەم جیاوازی بیروڕاو ڕوانین‌و قوتابخانە جۆراوجۆرانەی کەزادەی عەقڵانیەتن، ئەوڕاستییە دەردەخا کەعەقڵ‌و عەقڵانیەت ڕێژەین‌و ناتوانرێ ڕەهەندێکی ڕەهایان پێ ببەخشرێ، ئەمەش توانای مرۆڤی زیاتر کردووە. بۆ بەرهەمهێنانی تێڕوانین‌و بیروبۆچوون‌و خوێندنەوەی لێك جیا بەرامبەر بەدیاردەکان‌وسروشت‌ودەوروبەری. ((لەڕاستیدا باشی‌و خراپی عەقڵ باش‌وخراپە ڕێژەییەکانن، چونکە عەقڵی خالیس‌و عەقڵی ڕەها لەهەڵبژاردنەکانی مرۆڤدا نییە، هەروەك‌ووتمان بەردەوام غەریزەو سۆزەکانیش ئەداتی نووەمی ئاسینەکانن؟ لێرەوە هیچ مرۆڤێك مافی ئەوەی نییە تێڕامانە عەقڵییەکانی من بەڕێژە بزانێ‌وله بەرامبەرەوە پێی وابێت تێڕامانە عەقڵییەکانی خۆی ڕەهان چونکە خودی ڕەهابوون لەتێڕامانە عەقڵییەکانداوجوودی نییە ))[٬٬].

کاتێـك باسـی سـنووروتخوبێکی دیـاری کـراو بۆعـەقڵ دەکـرێ، ئەمەلەکارخسـتن و پەکخسـتنی چالاکییەکانی عـەقڵ ناگەیـەنێ" بـەڵکو هەوڵدانێکـە بۆناسـاندنی ئـەو جوغرافییایـەی کەعـەقڵ لەپانتاییەکەیـدا دەتوانێ ڕۆڵ و ئەرکی خۆی وەك پێویست ببینـێ کاتێکیش ڕەهەنـدێکی ڕەهادەدرێتەعەقڵ وسـەروەری مێـژووی پـێ دەسـپێررێ، ئەمـەش زیادەڕەوییەکە، وەك ئەوسنووردارکردنەی عـەقڵ کەبەهـەر پاساوێك بـێ بـواری جـوڵان و گـۆڕانی نـادرێ. ئەگـەر دان بەوەدابنـدرێ کەلەمێـژووی ئیسلامدا، بەهۆی بەهەڵەخوێندنەوەی دەقـەکانی ئـایین، ستەم لەعەقڵ کرابێ و ئەمەش بووبێتە مایەی چەندین کێشەو قەیران، ئەوالـەخۆرئاواش بـەهۆی ڕەهـایی بەخشـین بەعـەقڵ بەتایبـەتی لـەقۆناغی ڕۆشـنگەریدا جۆرە ستەمێکی دیکە لەعەقڵ کراوە. نابێ ئەوڕاستییەفەرامۆش بکرێ، کە بزافی عەقڵگەرایی لەخۆرئاوا، چەندین دەستکەوتی گرنگی پێشکەش بەمرۆڤایـەتی کـردو مۆدێرنەئـەو قۆناغەبوولـە مێـژووی مرۆڤایەتییـدا، کەخۆرهەڵات و جیهانی ئیسلامی نەیتوانی لەبەرامبەر بزافـووەرچەرخانە مێژووییەکەیدا سەرسام نەبێ و لاسایی نەکاتەوەویـەهرەی لێوەرنـەگرێ. ئەگەر چی بزافێکی لەم چەشنە، پێشتر لەمێژووی ئیسـلامدا دەرکـەوت و چەندین بیریارو زاناو فەیلەسوفی ئیسـلامی وەك شـافیعی و ئـیبن ڕوشـدو کەندی و فـارابی و ئـیبن خەلـدون و چـەندانی دیکـەو چـەندین قوتابخانـەو تێزی فیکری و فەلسەفی سـەریان هەڵدا" بـەڵام ئـەم بزافـە عەقڵگەراییـە لەهـەل و مـەرج وقۆناغێکی نالـەباردا بـوو، کەوردەوردەلـە ڕەوتـی خـۆی لایداو نەیتوانی ئەو ئەرکەجێ بەجێ بکا، کەلەپێناویـدا هـەنگاوی نـابوو. کێشەو قەیرانی عەقڵی موسڵمان، دەرەنجامی مامەڵـەی هەڵـەبوو لەگـەڵ هەریەك لەگۆڕاوو نەگۆڕاوەکاندا. زانایان وبیریـارانی ئیسـلامی ئەوەنـدەی

لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیان دەربارەی نەگۆڕاوەکان کردووەو لەم لایەنەدا مشتو مڕو قسەیان کردووەنەوەندەباسیان لە لایەنە گۆڕاوەکان نەکردووە "کەعەقڵ دەبێ ڕۆڵی خۆی لەوبوارەدا ببینێ، لەکاتێکداکەئیسلام جەخت لەسەر عەقڵ و گرنگیدانی دەکاتەوە. ئەمە نەک تەنهالەبوارە هەست پێکراوو بینراوەکاندا، بەڵکو بڕوا هێنان بەپەروەردگاریش پرۆسەیەکی عەقڵییەو کاتێك پێغەمبەران بانگەوازیان بۆئاینی خودا کردبێ‌و خەڵکیان بانگ کردبێ بۆبڕواهێنان بەنادیارەکان، خەڵك داوای بەڵگەی لێ کردوون. خودای گەورەش بەڵگەی بەهۆی پێغەمبەرانەوە نیشانی خەڵك داوە، بۆئەوەی خەڵك نادیارە ڕاستەکان لەو نادیارانە جیابکاتەوە، کەهەڵبەستراون و زادەی عەقڵی مرۆڤ بوون‌ونەفسانەو خەیاڵ باڵی بەسەردا کێشاون. ئەوەندەی لە خەیاڵدان‌ومێژووی ئێمەدا ناوی ئەو زانایانەی کەلەبوارەکانی فیقهو زمانناسیدا ناوبانگیان هەبووە، بەزیندوێتی ماوەتەوە ئەوەندە ناوی ئەوزاناو فەیلەسوفانە بەزیندوێتی نەماوەتەوە، کەلەبوارەکانی فەلسەفەو تێزی عەقلانیدا ناوبانگیان هەبووە. مەرج نییە دوو تێزو بیرۆکەو بزاف، کەلەناوەرۆکدا چوونیەکن، هەمان شێوازو بەرەنجامی چوونیەکیان هەبێ" جیاوازی زەمینەو جوغرافیاو هەلومەرجی لێك جیا دەرەنجامی لێك جیا بەبزاوتە چوونیەکەکان دەبەخشێ. ئەگەر دەرکەوتنی چەندین زاناو بیریارو چەندین قوتبخانەی‌وەك، موعتەزیلە بە قۆناغی ڕۆشنگەری ئەوروپا بەراوردبکەین، دەبینین دەرەنجامی هەریەکێك لەم دوو بزاوتە هاوشێوەیە لەیەکدی جیایە. ئەمەش پەیوەندی بەئاستۆی لێك جیای هەریەکێك لەم دووبزاڤەوەیە، کەلەکات‌وهەلومەرجی مێژووی لێك جیادا دەرکەوتن. ئەوپرسیارەی کەدەشێ بکرێ ئەوەیە، کەبۆچی خۆرئاوا

توانی بزافی عەقڵگەرایی گەشە پێبدلوبیگەیەنێتە ئاکامێك، کەچی خۆرهەلات نەیتوانی ئەم بزافە گەشە پێبدا، گەرچی مێژوویەکی دووورتریشی لەوبوارەدا هەبوو؟ هەریەك لە جابری‌و ئەرگون‌و تەرابیشی‌و عەبدولکەریم سروش‌و چەندانی دیکەوەلامی جۆراو جۆری پرسیاری لەم چەشنەیان داوەتەوە. مرۆڤ دوو سەرچاوەی هەیە بۆ مەعریفەو گەیشتن بەراستییەکان، یەکێکیان ئایینەو ئەوەی دیکە ئەووزەو توانا عەقڵییەیە کە مرۆڤ هەیەتی. هەریەك لەئایین‌وعەقڵ، کە دووسەرچاوەی ئەبستمولۆژین، مامەڵەکردن بەدرێژایی مێژوو لەگەڵ هەریەکێکیاندا، دەرەنجامی جۆراوجۆری لێ کەوتۆتەوە. مامەڵەی خۆرئاوا لەگەڵ ئایین‌و عەقڵ بەجۆرێك بووە کە، جیابووە لەومامەڵەکردنەی کەلە خۆرهەلات لەگەڵ هەریەکێکیاندا کراوە. دوالیزمی ئایین/ عەقڵ یەکێك نین لەو دوالیزمانەی کە دژبەیەك بوون، یان یەکێکیان بۆئەوە هاتبێ، هەوڵی سڕینەوەی ئەوەی دیکە بدا. محەمەد عابد ئەلجابری دەڵێ: ((ئەرەستۆ لەسەردەمی ئەسکەندەری مەقدونی‌و لەکاتی هەوڵە فراوانخوازییەکانی لەئاسیدا ژیاوە، بەرەنجامی ئەو هەولانەی ئەسکەندەر ئەوە بووە کەفیکری یۆنانی تێکەڵ بەئایینەکانی خۆرهەلات بووە، سێ سەدە دوای کۆچی ئەرەستۆو دەرکەوتنی ئایینی مەسیح (سەلامی خوای لێ بێ) بنەماکانی ئایینی مەسیحی لەگەڵ فەلسەفەی ئەرەستۆ، کەلەهەندێك لایەنەوە دژیەك بوون، لەهەمان کاتدا کەلکیان لەفەلسەفەی ئەرەستۆ، بەتایبەتی لوژیك وەرگرت))[١٢]. ئەگەر بەشێکی پەیامی ئایینە ئاسمانیەکان، تایبەت بووبێ بەڕوانین‌و دیدگای مرۆڤ دەربارەی نادیار، ئەواوێڕای پەیامی ئایین، مرۆڤ لەڕێگەی عەقڵی خۆیەوە شێوازێك لەبۆچوون‌و ڕوانینی دەربارەی بوون‌و ژیان دەست نیشان کردووە،

لەوبارەوەوێنای جۆراوجۆری چ لەلایەن دەستەبژێر(النخبة) یان زۆربەی خەڵکەوە پێشکەش کردووە. کاتێك ئایینە ئاسمانییەکان هاتوونو پەیامێکی نوێیان هێناوە کۆمەڵگە خاوەنی دیدو ڕوانینی تایبەتی خۆی بووەو لە سەرەتادا دژایەتی ئەو ڕوانینو بۆچوونو جیهانبینییەی ئایینی کردووە کەلەگەڵ بۆچوونو ڕوانینی ئەو ناکۆك بووەو لەهەمان کاتدالەزۆر بۆچووندا هەردووك لا تەباو کۆك بوون. کاتێك مرۆڤ بیری کردۆتەوە،کەئەو بۆچوونو مەعریفەیەی بەهۆی سروشتو عەقڵی خۆیەوە،وەدەستی هێناوە لەگەڵ ئەو پەیامەی ئایین هێناویەتی لەیەکدییەوە نزیکن، بڕوای بەوئایینە کردووە. ئەگەر هەندێك لایەنگروهەڵگرانی پەیامی ئایین، لەهەندێك کاتدا دژایەتی فەلسەفەو دەستکەوتە عەقلییەکانی مرۆڤیان کردبێ، ئەوا هەندێکی دیکە هەوڵی ئاشتەوایی‌و گونجانیان لەنێوان فەلسەفەو ئاییندا داوە. مرۆڤ هەروەك چۆن لەدیاردە سروشتی‌و بیتراوەکانی ڕوانیوەو بەپێی ئاستی گەشەی عەقڵی‌و قۆناغی کۆمەلایەتی هەڵوێستی لەبەرامبەرداوەرگرتووەو لەچەندین بیرۆکەوتێزدا، گوزارشتی لەم تێرامانو بیرکردنەوەیە کردووە، بەهەمان شێوە بەچەندین شێوازی جۆرلوجۆرو لەچوارچێوەی بیرۆکەی هەمە چەشنەدا گوزارشتی لە میتافیزیکیش کردووە. بەهەڵە تێگەیشتنو شێواندنی ئەو پەیوەندییەی کەلەنێوان، دوالیزمی (ئایین–عەقڵ)داهەیە، یەکێکەلەو گرفتانەی کەڕووبەڕووی مرۆڤ بۆتەوە، هەرکۆمەڵگەو تاکێکی ناو کۆمەڵگە بەشێوەیەكو لەڕوانگەیەکەوە مامەڵەی لەگەڵ ئەم دوالیزمەدا کردووە، یەکێك لەگرفتەکانی ناو پانتایی فیکری ئیسلامی شێواندنی ئەم پەیوەندییەیە. عەقڵی ئیسلامی بەهۆی نزیکی لەدەقەکانی ئایینەوە، جۆرێك لە پیرۆزی پێ بەخشراوەو لەهەمان

کاتدا هەر ئەم بە پیرۆزی تەماشاکردنەی دەقەکانی ئاینی بەشێوەیەك گوزارشتی لێ کرلوە، کەبووەتە هۆی تەسك بوونەوەی سنووری چالاکییەکانی عەقڵ. زۆر جار لەمێژووی ئیسلامدا لەپاڵ دەقی ئایینیدا، قسەی زانایەکی ئایینی بەرگێکی پیرۆزی بەبەردا کراوەو بەبێ دەستکاری کردن‌و گومان مامەڵەی لەگەڵدا کرلوەو لەهەمان کاتدا قسەوونەزای بیریارو فەیلەسوفێکی ئایینی بەپاساوی جۆراوجۆرەوە بەگومانەوە سەیرکراوەو لەپەرلوێزی مێژوودا ماوەتەوە. بەرهەمی هزرو عەقڵی بیریارو فەیلەسوفانی‌ئیسلامی لەپاڵ ئایینداو لەسنووری تایبەتی خۆیدا، ڕۆڵی لەگەشەپێدان‌و دەوڵەمەندکردنی عەقڵ‌و هزری ئیسلامیدا دیوە. لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی دەقەکانی قورئان‌و فەرموودە لەلایەن زانایانی ئیسلامەوە، بەبەشێك لەبزاڤی عەقڵگەرایی لەمێژووی ئیسلامدا دەژمێررێ. لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی دەقەکانی ئاین چ ئایینی ئیسلام‌و ئاینەکانی پێش ئیسلام، کەلەلایەن زانایانی ئەم ئایینانەوە ئەنجام دراون، پێویستیان‌و بەجۆرێك لە چوارچێوەو سنووردارکردن هەیە. قسەکردن لەسەر دەقێکی ئایینی، جیایە لەقسەکردن لەسەر دیاردەیەکی سروشتی‌و کۆمەڵایەتی‌و دەقێك، کەبەرهەمی عەقڵ‌و هزری مرۆڤە. کاتێك ئاین هاتووەو هەندێك ڕاستی ناوبوونی بۆمرۆڤ ڕوون کردۆتەوە، مانای ئەوەنییە ئیدی مرۆڤ نابێ قسەلەسەر دیاردەکانی دیکەی بوون بکا، کەئاین بەجێ ی هێشتووە بۆعەقڵی مرۆڤ. یەکێك لەوگرفتەی کەلەمێژووی بزووتنەوەی فیکری ئیسلامیدا بەرچاو دەکەوێ، ئەوەیە کەکاتێك نوسەرو بیریارێکی ئیسلامی لەهەریوارێکی فیکری‌و فەلسەفەو ئەدەب‌و هونەردا کاری کردبێ، بەئەرکێکی ئایینی زانیوە کەڕاڤەو لێکۆڵینەوەش بۆدەقەکانی ئاین بکا. بۆیە زۆرجار لەمێژووی

ئیسلامدا شاعیرێك لەپاڵ بەهرەی شیعریدا، خۆی بەلێکدانەوەو ڕاڤەکردنی دەقەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە، خەریك کردووە. ئەم حاڵەتە لەناو هەندێك لەبزوتنەوە ئیسلامییەکانی ناوڕابوونی ئیسلامی ئەم سەردەمەشدا دەبینرێ. نابێ نکۆڵی لەوڕاستییە بکرێ کەلێکدانەوەو ڕاڤەکردنی دەقەکانی قورئانو فەرموودە پرۆسەیەکی عەقڵانین‌و هەرئەمەشەبووەتەهۆی ئەوەی کەلەمێژووی فیکری ئیسلامیدا، چەندین قوتابخانەو ڕێبازی لێك جیا لەو بارەوە لەدایك ببن. ڕاست نییەوابزانین ئەم ڕاڤەکردن‌و لێکۆڵینەوەیەبەتەنیا دەستەبەری بزاڤووەرچەرخانی عەقڵگەرایی‌و فیکریی مێژووی ئیسلامیان کردووەو درزوکەلێنی بەجێ نەهێشتووە. ئەگەر لەم لایەنەوە بزاوتی عەقڵگەرایی هەنگاوێك چووبێتە پێش، ئەوا زۆر قۆناغ‌و سەردەم ئاوێنەی قۆناغ‌و سەردەمی پێش خۆیان بوون‌و هەنگاوەکان سست بوون. دەبێ بەداخ‌و کەسەرێکی زۆرەوە، ئەوڕاستیە بسەلمێنین، کەچارەنووسی زۆربەی بزاڤەعەقڵی‌و فکرییەکان، لەکلتورو مێژووی ئێمەدا شکست بووەوتەمەن کورت بوون.

## دوالیزمی ڕەسەنایەتی و هاوچەرخێتی

ئەگەر داهێنانو لایەنە ئەستوو(ماددی)ییەکانی ژیانی مرۆڤ پەیوەندییان بەیەکدییەوە هەبێو ئەمیان ئەوەی دیکە تەواو بکا، ئەوانەو پەیوەندیو یەکدی تەواو کردنە بۆلایەنی کلتوریو ڕۆشنبیریو فەرهەنگیش هەر ڕاستە. گەلو نەتەوەو شارستەنیەتییەکان، بەدرێژایی مێژوو بەئەندازەی پەیوەندیو نزیکییان لەیەکدییەوە کاریان لەیەکدی کردووە. لەگەڵ هەرتێزو بۆچوونووەرچەرخانێکی نوێی مێژووییدا، کۆمەڵگە بەدیدگاو روانینی جیاوە، مامەڵەیان لەگەڵ ئەم گۆرانکاریو وەرچەرخانەدا کردووە. هەندێکیان پێی قایل بوونو پشتیوانییان کردووەو هەندێکی دیکە بەگومانەوە سەیریان کردووەو بەهەڕەشەیان زانیوە بۆسەرئەو بونیادەی کەڕەسەنایەتی کۆمەڵگە دەپارێزێ، هەندێکی دیکەش لەم نێوانەدا هەڵوێستێکی میانەڕەوییان وەرگرتووە، کاتێك بەڕاڵیبوونەوە(الاعجاب) سەیری ئەم تێزوگۆڕانکارییە نوێیەیان کردووە، پاراستنی ڕەسەنایەتیو کلتوری کۆمەڵگەشیان بەگرنگ زانیوە. گۆرانکاریو سەرهەڵدانی تێزو بیروبۆچوونی نوێ لەهەربوارێکدابێ، جۆرێك لەناکۆکیو دابڕان لەژینگەو دەوروبەرو دابو نەریتەباوەکان لەخۆدەگرێو بانگەشە کردنێکە بۆئەو ڕەسەنایەتییەی کەلەسەردەمو باروئۆخێکی مێژووییدا باڵی بەسەر کۆمەڵگەدا کێشاوەو دوایی لەبیرچۆتەوەو لەچوارچێوەی ئەو نوێ کردنەوەو تازەگەرییەدا جارێکی دیکە خۆی نمایش دەکاتەوە. ڕەخنەگرتن لەئێستاو ڕابووردووی نزیك، دەبێتە میکانیزمێك بۆگەڕانەوە بۆ ڕابووردوویەکی دووری لەبیرکراو تابەهۆیەوە پرۆژەی نوێگەری ئەنجام بدرێ"[1]. مەرج نییە هەرتێزو بۆچوونێکی نوێ کەلەدەرگای مێژوو دەدا، خاوەنی پێکهاتەیەکی تەواو

جیابێ لەوانی پێش خۆی، بەڵکو دەشێ لەڕووی ناوەڕۆکەوە جیاوازی لەگەڵ ئەوانی پێش خۆیدا نەبێ، بەڵام مامەڵەکردن بەعەقڵێکی جیالەعەقڵی پێشتر، بەرگێکی نوێ بەبەرئەو تێزەدا دەکاو لەدیدگایەکی دیکەوە دەخوێندرێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆکارێك بۆئەوەی ناسنامەی هاوچەرخایەتیمسۆگەربکا. (محەمەد عابد ئەلجابری) ئەو گۆڕانکارییە بەنموونە دێنێتەوە، کەئیسلام هێنایەکایەوەو دژبەنەریتو ڕەوشتەباوەکانی سەردەموەستاو بانگەشەی کرد بۆگەڕانەوە، بۆڕابووردوویەکی لەبیرکراو، ئەویش ئایینی ئیبراهیم، ئایینی تاکخوایی (التوحید) بوو، کەپێچەوانەی دابو نەریتی باوی ئەو کاتەی کۆمەڵگە بوو. لێرەدا پرۆسەی گەڕانەوە بۆڕەسەنایەتی، هاوشێوە بووە لەگەڵ ڕێنسانسی ئەوروپا، کەئەویش لەو خاڵەدا دەستی پێ کرد، کەگەڕایەوە بۆ کلتوری یۆنانیو ڕۆمانی، ئەویش لەتێزو بۆچوونی هیومانیزمو شۆڕشێکدا خۆی نواند کە دژبەئاکارەکانی مەسیحیەتی باوی ئەو کاتەبوو. دواتر لەبانگەشەکردن بۆ چاکسازی ئایینیو گەڕانەوە بۆسەرچاوە ڕەسەنەکەی مەسیحیەتدا بەرجەستەبوو.[**]. زۆر جار بەرهەمو داهێنانێکی سەردەمو قۆناغێکی ڕابوردوو، دەبێتە سەرچاوەی بەرهەمو داهێنان لەسەردەمو قۆناغێکی دواتردا. بەپێچەوانەوە، دەشێ بەرهەموگۆڕانکاریو داهێنانێك لەهەر بوارێکدابێ، نەتوانێ لەگەڵ ئەوسەردەمەدا هەنگاوبنێو بژی کەلێی لەدایك بووە. وەك چۆن ڕابوردوو پێویستی بەچۆنێتی مامەڵە لەگەڵ کردندامەیە، بەجۆرێك کەلە خزمەت بزاڤو گۆڕانکاری هاوچەرخایەتیدابێ " بەهەمان شێوە تێزو بۆچوونی نوێو هاوچەرخیش لە هەر سەردەموقۆناغێکدابێ، پێویستی بەچۆنێتیو شێوازی مامەڵە لەگەڵ کردندا هەیە. لەگەڵ ئەو حەزە

سروشتییەی مرۆڤ بۆ گۆڕانکاریو نوێکردنەوەو کردنەوەی زیاتری دەرگاکانی عەقڵ بەمەبەستی شارەزابوونووەدەست هێنانی زانیاری زیاتر دەربارەی ژیانو بوون، چەندین لایەنی جێگیرو نەگۆڕ لەپێکهاتەو سایکۆلۆژیای مرۆڤدا هەیە، کە دەستی گۆڕانکاری نایانگاتیّو لەگەڵ هەنگاوەکانی مێژوو، بەجێگیری‌و نەگۆڕاوی دەمێننەوە. کاتێک ڕۆشنگەری ئاراستەیەکی پێچەوانەی پێش خۆیوەردەگریّو سەرووەرێتی بە عەقڵ دەبەخشیّ ئەوەی لەدەرەوەی عەقڵە ڕەتی دەکاتەوە، هێندەی پیّ ناچیّ ئەفسانەو چەندین چەمکی دیکە، کەڕۆشنگەرییەوەدەری دەنان جارێکی دیکە دەخوێندرێنەوە. یەکێکیوەك (لیڤی شتراوس) لە پرۆژە ئەنسرۆپۆلۆژییەکەی خۆیدا جێگەیەکی تایبەت بۆئەفسانەو عەقڵی کۆمەڵگە سەرەتاییەکان تەرخان دەکا.

ئەگەر شارستانیەتییەکان بەدرێژایی مێژوو کاریان لە یەکدی کردبیّو پرۆسەی بەخشینوەرگرتنیان لە بەرامبەر یەکدیدا ئەنجام دابیّ، ئەوا هەرگەلو نەتەوەو شارستانیەتێکیش هەمان پرۆسەی بەرامبەر بەخۆی لەنێوان: نوێنیّ / ئەمڕۆ، ڕەسانەتی/ هاوچەرخایەتیدا ئەنجام داوە.
مەرج نییە هەمووکاتێك گەڕانەوەو ئاوڕدانەوەی مرۆڤ لەڕەسەنایەتیو ڕابووردوو، بەرەنجامی هەوڵو کۆششێکی عەقڵانی بیّ، بەڵکو زۆر جارئەم پرۆسەیە لەسۆزو هەڵچوونو رۆمانسیەتێکدا خۆی دەنوێنیّ، کە مرۆڤ بۆ ڕابووردوو هەیەتی. هەندیّ جار ڕەسەنایەتیو ڕابووردوو دەبێتە ئەو باوەشە گەرمەی کە، ئێستاش لەئامێز دەگریّو بوار بۆپرۆژە هاوچەرخییەکان ناهێڵێتەوە. زۆر جار بەپێچەوانەوە تێزو پرۆژەی هاوچەرخ واخۆی دەرازێنێتەوە، دەیەویّ جوانیەکانی ڕەسەنایەتیو ڕابووردوو لەنێو خۆیدا بشارێتەوە. نابیّولبزانین، ڕەسەنایەتیو

هاوچەرخێتی ئەلتەرناتیفی یەکدین و ئەمیان دێ بۆسڕینەوەی ئەوەی دیکە " بەڵکو زۆرجار بەتەنیشت یەکەوە لەسەر جەستەی ئێستادەردەکەون و هەموو کاتێکیش ئێستا ناتوانێ نکوڵی لەشوێنپێکانی ڕابووردوویکاو شوێنپێکانی ڕابووردوو لەسەر جەستەی ئێستا ناسڕێنەوەو کوێرنابنەوە. کاتێك کاری ئێستاو پرۆژەی هاوچەرخ بریتی دەبێ لەتۆخ کردنەوەی شوێنپێکانی ڕابووردوو، ئەوا جارێکی دیکە ڕابووردوو دووبارە دەبێتەوە. بۆخۆپاراستن لەم دووبارەبوونەوەیەو هەنگاونان بەرەو گۆڕانکاری و هاوچەرخایەتی، دەبێ جێ پێکان بگوازرێنەوە. نابێ ئەوڕاستییە فەراموش بکرێ، کەلەگەڵ هەرگورانکاری و هەوڵێکی ڕۆشنگەریداو هەوڵدان بۆ((ئەفسانە دامالین)) کەسروشتێکی قۆناغی ڕوشنگەری بوو، بەگوتەی (ماکس فیبەر)[11] مرۆڤ پێ بزانێ یان نەزانێ درێژە بەتایبەتمەندی و خەسڵەتە سروشتی و زگماکییەکانی خۆی دەدا. ئەگەر کەفو کوڵ و هەڵچوونی ئەو گۆڕانکارییەوای لێ بکا، نکوڵی لەوڕاستییە بکا "ئەوا دوای دامرکاندەوەو کپ بوونەوەی ئەو هەڵچوونە دەگەڕێتەوە بۆئەم حاڵەتە سروشتی و زگماکییەی کەخودا مرۆڤی لەسەر دروست کردووە. هەوڵدان بۆگۆڕانکاری و دەستکاری کردنی سیماکانی بوون و ژیان و گەڕان بەدوای نهێنیەکاندا، لەوحاڵەتە سروشتی و زگماکییە جیاناکرێتەوە. جابری جەخت لەسەر ئەوە دەکا، کەمێژووی ئێمە زیاتر مێژووی جیاوازی بیروڕایە " نەك بنیاتنانی بیروڕا. ئەو جیاوازی بیروڕایەی جابری باسی دەکا بەرهەمی ململانێ سیاسییەکانی سەردەم و قۆناغەجیاجیاکانی مێژووی ئیسلامی بووە. فیکرو ڕوانین لەهەر ئاستێکدا بووبێ، کراوەتە قوربانی ململانێ ی دەسەلات. ئەوانەی لەسەر دەسەلات

بەگژیەکدیداچـوون، رێگـەیان لەگەشـەی فیکـرو عـەقڵ گرتـووەو کردوویانەتـە قوربـانی قـورخکردنی پانتاییـەکانی دەسـەڵات. هەرلایەنـە بەجۆرێك فیکری بۆمەبەستی دەسەڵات بـەکارهێناوەو لـەم حاڵەتەشدا فیکـرو تێزەفیکرییـەکان لەپـەیامی ڕاسـتەقینەی خۆیـان دوورکەوتوونەتـەوە. هـەرکاتێك ئاراسـتە فیکـری‌و عەقڵییـەکان لەکایەی ململانێ ی فیکرەوە گوازرانـەوە بـۆ کایەی سیاسـەت‌و دەسـەڵات‌و ئـەو گەمـە، فیکریـان کـردە پاشـکۆی خۆیـان، ئـەوا ڕووداوە مێژووییـەکان‌و پەیوەندی نێوان فیکرو دەورووبەر شوێنگەی خۆیان‌ون دەکـەن. ڕوانـین‌و دیدگاکان دەربارەی ڕەسەنایەتی‌و هاوچەرخێتی دوورنـین لـەم گەمەیـەو بۆیەدەشێ قبولکردن‌و قبوڵنەکردنی تێزو بۆ چـوونی نـوێ‌و هەوڵـدان بـۆ دانـانی بەربەسـت‌و لەمپـەر لەبەرامبـەر ئـەو هەنگاوانـەی بەمەبەستی گۆرانکاری‌و دەستکاری کردنی ڕوخسـاری هەنـدێك نـەریت دەنـرێن، ئـەو هێزانەیان لە پشتەوەبێ کەبەرژەوەندییان لەمانەوەو دەستکاری نەکردن و دۆگمابییـدابێ. هەنـدێکیش ناهۆشـیارانەو بەبێ‌وورد بونـەوەو هەڵسـەنگاندن، گۆرانکـاری‌و چاکسـازییان ڕەت کردۆتـەوەو بەئەنـدازەی ناهۆشـیاری‌و بـێ ئاگـایی خۆیـان، پاسـاویان بۆئـەم ڕەتکردنەوەیـە هێناوەتـەوە. ئـەو مانایـەی عـەقڵ‌و لوژیـك بـەدوالیزمی ڕەسـەنایەتی‌و هاوچەرخێتی دەبەخشێ، جیایەلـەو مانایـەی هەسـت‌و سۆزو هەڵچوون پێی دەبەخشێ. زۆر جار لاوازی گوتاری ئێستاو هەنوکەیی،لەکۆنەستی کۆمەڵـدا، کارێکی‌وادەکاکـە ڕەسـەنایەتی‌و رابـووردوو گوتـاری زاڵـبن. زاڵبوونی گوتاری ڕەسەنایەتی‌و رابووردوو، جۆرە هەوڵێکە بۆدەربازبوون لەو گرفتانەی لە ئێستادا دێنەپێشەوە. سروشتی مرۆڤوادەخوازی کەبـە ئاسانی دەستبەرداری ئەو دابو نەریت‌و حاڵەتە باوانە نەبێت کەبووەتـە

بەشێك لەنەستی‌و لەگەڵی ڕاهاتووە. بۆیە لەبەرامبەر تێزو بۆچوونی نوێدا سەرەتا هەست بەجۆرە ترس‌و گومانێك دەكا. ئەگەر دیوێكی گۆرانكاری‌و نوێخوازی جوان‌و سەرنج ڕاكێش بێ، ئەوا دیوێكی دیكەی بە پێچەوانەوەیە. ئەم حاڵەتە بۆ ڕەسەنایەتیش ڕاستە، كاتێك كۆمەڵێك دیوێكی جوانی ڕەسەنایەتی دەبینن‌و داكۆكی لێ دەكەن، كۆمەڵێكی دیكە دیوەكەی دیكەی دەبینن‌و ڕەتی دەكەنەوە. ئەگەر مرۆڤ بەسروشت گومانی لەنوێخوازی هەبێ‌و بەترسەوە لەگۆرانكاری‌و دیاردەی نوێ بڕوانێ، ئەوا گەڕانەوە بۆباوەشی ڕەسەنایەتی‌و ڕابووردوو دەریچەیەكە بۆڕزگاربوون لەو ترس‌و گومانە. مەرج نییە هەموو بانگەشەكردنێك بۆ نوێخوازی، لەكۆتاییدا دابڕانێك بووبێ لەداب‌و نەریتە باوەكان‌و خزمەتی بزاڤی فكری‌و عەقڵگەرایی كردبێ‌و كۆمەڵگەی لەقۆناغێكەوە بردبێتە قۆناغێكی دیكە.

# ڕۆشنگەری لە نێوان عەقڵ و ئاییندا

ئەگەر هەربزاڤــووەرچەرخانێکی مێژوویی بـەململانێ دەسـت پێبکـا، ئــەوا ڕۆشــنگەریش وەك هــەر بزاڤــووەرچەرخانێکی دیکـە بـەململانێ دەسـتی پێکـرد. ئەوەنـدەی شـێوازی ململانێیەکـە لەهـەر بزاوتێکـی مێژوویـیدا گرنگـە، خـودی ململانێیەکـە گـرنگ نییـە. چـونکە ململانـێ تایبەتمەندیو خەسڵەتێکی هەر بزاڤووەرچەرخانێکی مێژووییـە " بـەڵام ئەوەی ڕەوتی ململانێیەکە دیاری دەکاو بەرەو ئاقـارو ئاراسـتەی جۆراو جـۆری دەبـا، شـێوازو جـۆری ململانێیەکەیـە. جـۆری هەرململانێیـەك دەرەنجامی ئەو ململانێیە دیاری دەکاو بەئەندازەی شێوازی لێك جیـای ململانێیەکـە دەرەنجـامی جیاجیـای لـێ دەکەوێتـەوە. ململانـێ لەسـەر دەسەڵات جیایە لەململانێ ی فیکریو فەلسەفیو کۆمەڵایـەتی. ململانـێ ی نێـوان دووکـەس جیایـە لـەململانێ ی نێـوان گـروپو تـاقمو گـەلو نەتـەوەو شارسـتانیەتییەکان. ڕۆشـنگەری قسـەکردن بـوو دەربـارەی ئەوتـەزاو چـەمکانەی کەپێشـتر قەدەغـەبوو قسـەیان لـەبارەوە بکـرێ. بەواتایـەکی دیکـە قســەکردن لــەبارەی ئــەو چــەمکوتەزایانەوە، واسنووردار کرابوو، دەرفەتی ئەوەیان نەهێشتبوو، مانایـەکی دیکـەیان پێ ببەخشرێ جگە لەومانایانەی پێشتر پێیان بەخشرابوو. ئەگەر هەوڵی پێغەمبەران بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی بۆ ئەوە بـوویێ، کـە کۆمەڵگـە لـەتێروانینو بیروبـاوەڕی هەڵـە ڕزگـار بکـەنو بانگـەوازی تـاکخودایی (التوحید) بڵاوبکەنـەوە، ئـەوا قۆنـاغی ڕۆشـنگەری هەوڵـدانی مـرۆڤ بـوو لەلایـەن بیریـارو فەیلەسـوفانەوە بـۆ ڕزگـارکردنی مرۆڤایـەتی لـەو تاریکسـتانەی دووچـاری بوویـوو " پێغەمبـەران بـەهۆی بانگـەوازی خوداییەوە مرۆڤایەتییان لەئەفسانەو تێـزی هەڵـە ڕزگـارکرد "بـەڵام ئـەو

بیریـارو فەیلەسـوفانەی قۆنـاغی ڕۆشـنگەری لەبەرامبـەر ڕەخنـەگرتن‌و هەوڵدانیان بۆڕزگارکردنی کۆمەڵگە لەئەفسانەکانی پیاوانی کڵێسا، جگـە لەعەقڵ پەیامێکی دیکـەیان پـێ نـەبوو. کـاتێ فرویـد ستایشـی مـارکس دەکا، کەمرۆڤ لەخەیاڵپلاوی (الوهم) ڕزگار کرد، ئەوەش ئاشارێتەوە کـە جۆرە خەیاڵپلاوییێکی دیکەی پێشکەش کرد[٣٧].

نابێ‌وابزانین کە هەرهەوڵدانێکی مـرۆڤ بـۆ چاکسـازی‌و دژایـەتیکردنی ئەفسـانەو خـەیاڵ، کـەرەوتی گۆرانکارییـەکانی کۆمەڵگـە ئـوادەخـەن، ئاکامەکـەی کۆتـایی هێنـان بـێ بـەو ئەفسـانەو خەیاڵانـەی دژایـەتییان کراوە. ڕۆشنگەری هات تاکو شوێنێکی دیکە بۆعەقڵ دەست نیشان بکا، کە پێشتر نەیبوو. هات بۆئەوەی سـەرلەنوێ چـەمك‌و گوتـەزاکان بـەپێی ئـەو تێگەیشـتن‌و بۆچـوونەی فەیلەسـوفانی ڕۆشـنگەری هـەیانبوو دابڕێژێتەوە. ڕێگای بەردەم هەنگاوەکانی ڕۆشنگەری تەخت‌و بێ کۆسپ نـەبوو. لەگـەڵ دەرکـەوتن‌و سـەرەتاتکەکردنیدا، ڕووبـەڕووی چـەندان گرفت‌و کێشە بـۆوە. ڕەخنـەگرتن سیمایەکی دیـارو گەشـی ڕۆشـنگەری بـوو، کەلـەوێوە لـەدەرگای مێژوویـەکی نـوێ ی دا "بـەلام ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێ، کەوتـەزاو چـەمکەکانی ڕۆشـنگەری‌و ئـەوەی بانگەشـەی بۆدەکرد، ڕووبەڕووی ڕەخنە نەبوو بێتەوە. ڕێبین هەردی دەڵـێ ((بـەلام ئایا مرۆڤو خود هۆشیاری ئەووتەزایانـەن کـە ئیـدی نـاتوانین ڕەخنـەیان ئاراستە بکەین‌و ببین بە بەڵگە ئەویستێك کە کەس ناتوانێ ئەیسەلمێنێ ؟ ئەگەروەلامی ئەم پرسیارانەش لەرەخنەکانی ئەو بیریـارەورد بینانـەدا ئەدۆزینـەوە کەبـەر لـە هەرشتێك رەخنـەیان ئاراسـتەی ئەموتەزایانـەی ڕۆشـنگەری‌کرد ئـەوا دەتـوانین‌وەلامی ئـەو پرسـیارانە لـەڕووداوە مێژووییەکانی دوای ڕۆشنگەریدا بدۆزینەوە))[٣٨].

بـاروبۆخی سیاسـی و ئـابوری و کۆمەڵایەتی و ناسـتی تێگەیشـتنی تاکەکانی هەر کۆمەڵگەیەك، رۆڵی دیارو بەرچاوی هەیە لـەوەرگرتن یـان رەتکردنەوەی هەر بیرو باوەڕو تێزێك کە لەدایك دەبێ. چەندین هۆکـاری خودی و بابەتی و ئەو کێشەو قەیرانە یەك لەدوای یەکانەی کـە دووچـاری جەستەی کۆمەڵگەی ئەوروپا بوو بوو، رێخۆشکەر بـوون بـۆ دەرکـەوتن و فۆرمەلـە بـوونی ئـەو تێـزو گوتەزایـەی کـە بـە رۆشـنگەری نـاوزەدکرا. راسـتەکە باسـی رۆشـنگەری دەکـرێ، وێنـای کـاتو شـوێنێکی تایبـەت دەکرێ، بـەڵام ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێ کـە پرسـیار کـردن و هەوڵـدان بـۆ گەڕانـەوەی سـەروەرێتی عـەقڵ و کردنـەوەی ئـەو دەرگایانـەی بـە هـەر پاساوێکەوە بـووبێ داخرابـوون، تایبـەت بـێ بـەکاتو شـوێنێکی دیـاری کراوەوە، بەڵکو بـە درێـژایی مێـژوو، مـرۆڤ لـە سـوتنگەی ئـەو سروشـت و زگماکەی کە لـە سـەری دروسـت کـراوە، خـاوەنی پرسـیارو هەڵوێسـت و تێڕامانـــە، بـــەردەوام لــــە خــــۆی و سروشــــت و ژینگــــەو دەورو بەری وردبۆتـەوەو رامـاوەو پرسـیاری دەربـارەی ژیـان و بـوون کـردووە. ئەگەر لە سەردەم و قۆناغێکی مێژووییدا بە هۆی چەندین پاساوی جۆراو جۆرەوە مافی پرسیار کردن لە مرۆڤ زەوتکرابێ و کۆمـەڵێك هەوڵیاندابێ دەرگاکانی عەقڵ و لۆژیك دابخەن، ئـەوا کۆمـەڵێکی دیکە هەوڵیانداوە ، ئەو دەرگایانە بکەنەوە. ئەو ململانێیەو مشتومڕە، گوڕو تینێکی دیکـەی بەو تێزو بۆ چوونانە دلوەو هاندەرێك بـووە، بـۆ زیـاتر گەشـەی عـەقڵ و هزر. گەڕانەوەی سەروەرێتی و شوێنگەیەکی دیکە بۆ عەقڵ پەچەکرداری ئەو سەرکوتکردن و چەپاندنەی عەقڵ بوو، کە لەلایەن پاپاو قەشـەکانی ئەوروپاوە ئەنجام دەدرا.

کاتێك ئاینی مەسیحی لە لایەن چەند کەسانێکەوە، لە پەیامی خۆی دوور دەخرێتەوەو قۆرغ دەکرێو بەناوی ئایینەوە قسە لە سەر ئەو بابەتانە دەکرێ کە بەرەنجامی ڕوانینو عەقڵی مرۆڤنو بەرگێکی پیرۆزیان بەبەردا دەکرێ، هەموو ئەمانەو چەندان هۆکاری دیکە، ڕێگە خۆشدەکەن بۆ کۆمەڵێك لە بریارو فەیلەسوف کە بانگەشەی گۆرانکاریوورەرچەرخانو چرکەساتێکی دیکەی مێژوویی بکەن. فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری نەیانویست ئاوڕ لەفەیلەسوفانی پێش خۆیان نەدەنەوە، کە هەوڵیاندا عەقڵ بەئەزموونەوە گرێ بدەن. فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری پێیانوابوو بۆ ناسینی مرۆڤیش، دەتوانرێ هەمان میتۆد بەکار بهێنرێ کە پێشتر نیوتن بۆ زانستە سروشتییەکان بەکاری هێنا"". ئەوان لە زانستە مرۆییەکاندا، بۆ ئەو یاسا هەمەکیو نەگۆرانە دەگەران کەلەزانستە سروشتییەکاندا هەبوون. یەکسانکردنی زانستە سروشتییەکان بەزانستە مرۆییەکان یەکێك بوو لەو گرفتو ڕەخنانەی کەڕووبەڕووی فەیلەسوفانی ڕوشنگەری بۆوە. دژایەتیکردنی هەر تێزو بۆچوونێکی نوێ بە ئامانجو مەبەستی جیاجیاوە دەکرێ، کاتێك کلێسا نیگەرانی خۆی بەرامبەر بەبزافی ڕۆشنگەری دەردەبڕی، لەترسی ئەو شوێنگەو دەسکەوتە کۆمەلایەتییەوە بوو کە لە ئەنجامی بێ ئاگاییو ناهۆشیاری خەڵکەوە دەستی کەوتبوو. هەلو مەرجو بارودۆخی دژوارو ناهەمواری ئەو کاتەی ئەوروپا، ڕێگەی لەبەردەم ڕۆشنگەریدا خۆشکرد بۆ زیاتر خستنەڕووی تێزو بۆچوونەکانی، سروشتی مرۆڤوایە لەحاڵەتی تەنگەژەو قەیرانەکاندا بەئاسانی بڕوا بەوتێزو بۆچوونانە دەکا، کە بانگەشەی ئەوە دەکەن مرۆڤ لەو قەیرانو تەنگەژانە ڕزگاردەکەن کە ڕووبەڕووی بۆتەوە. دەرکەوتنی سەرەتاکانی ڕۆشنگەری دوای شۆڕشی

فەرەنسی (١٧٨٩)و هەوڵدان بۆ کردنەوەی زیاتری دەرگاکانی عەقڵ‌و بانگەشەی ئازادییەکانی تاکو عەقڵێکی (بونفارستی) گەردوونیی جوگرافیای رۆشنگەریان لە سنوورەکانی ئەورووپادا هێشتەوە(٢٠).

هەنگاوە خێراکانی رۆشنگەری‌و دەسکەوتە یەك لەدوای یەکەکانی‌و متمانە بەخشینی لەرادەبەدەر بەعەقڵ، وای لە عەقڵمەندان‌و فەیلەسوفانی رۆشنگەری کرد، کە نەك تەنها لایەنە نارۆشن‌و تاریکەکەی رۆشنگەری‌و عەقڵ نەبینن * بەڵکو خۆشباوەریان گەیشتەرادەیەك، کە پێشبینی ئەورەخنەو گرفتانەیان نەکرد کە رووبەروویان بۆوە. ئەگەر کلێسا بە ئامانج‌ومەبەستێکی تایبەتەوە دژایەتی رۆشنگەری کرد، ئەوا رۆمانتیکییەکان ئەو جەنگەیان بەچەکی مەعریفەو فکرکرد. ئەگەر رۆشنگەری دوای کردنەوەی دەرگاکانی عەقڵ‌و پرۆژە رەخنەییەکەی چەندین دەستکەوتی پێشکەش بەکۆمەڵگەی خۆرئاوا کردبێ * ئەوا لەبەرامبەر دەرەوەی خۆرئاوادا بەپێچەوانەی ئەو دروشمانەوە رەفتاری کرد، کەهەر لەسەرەتاکانی رۆشنگەرییەوە بانگەشەی بۆ دەکرد. هێندە ئەفسانەو خەیاڵی پووچی سەدە لەدوای سەدە تێکەڵ بە ئایینی مەسیحی بوو، نەیتوانی لەبەرامبەر ئەو تەوژمە عەقڵانی‌و رەخنەییەیرۆشنگەریدا خۆی رابگرێو هەرەسی هێنا. دەمێك بوو کلێسا دەرگای لەرووی ئەو پرسیارانە داخستبوو، کەرۆشنگەری لەسەرەتاکانی دەرکەوتنییەوە دەیوروژاندن. شکستی کڵێسا لەبەرامبەر رۆشنگەریدا، شکستی ئەو عەقڵە دوگماییەبوو کەخۆی بۆوەلامی ئەو پرسیارانە ئامادە نەکرد بوو کەرۆشنگکەری بەمتمانە بەخۆبوونەوەوەڵەمی دەدانەوە. ئەوکاتەی کەکڵێساوەخەبەر هات‌و چاوەکانی گلۆفی‌وویستی لاسایی رۆشنگەری بکاتەوەو وەڵامێك بۆ پرسیارەکان بدۆزێتەوە،

جگەلەوەی کەوەڵامەکە لەلایەن ڕۆشنگەریەوە عەقڵانیانە درابوونەوە، وەڵامەکانی کڵێسە دوای ئەو خەوە قوڵە نەك مایەی متمانەو ڕالیێ بوون نەبوون " بەڵکو ئەو کاتە بەسەر چوو بوو کە خەڵك چیدیکە گوێ لەووەڵامانە بگرێ. وێنا کردنو دەرکەوتنی جوگرافیایەك وکات و سەردەمێکی دیاریکراو لە ئاوێنەی خەیاڵو مزردا، ئەوەناگەیەنی کە ئەم عەقڵە دوور لە عەقڵەکانی دەرەوەی خۆی و بەبێ کاریگەری ئەوان لەسەری هەنگاوی نابێ. بانگەشەی (کانت) بۆجیاکردنەوەو دیاری کردنی سنوورەکانی نێوان جیهانی مەعریفەو میتافیزیك، کەم تا زۆر کاریگەری فەیلەسوفی ئیسلامی (ئیبن روشد)ی لەسەربوو (ئیبن روشد) دەڵێ:(( هەرکەسێك بیەوێ خودا بەراستی بناسێ، پێویستە لەناوەڕۆکی شتەکانوورد بێتەوەو لەبەرامبەر ئەو ئەفراندنە ناوازانەی بوون، هەڵوێستەبکا. هەرکەسێك لەراستی بەدیهێنراوەکان نەگا بەدیهێنەریکیش ناناسێ))[٣٦]. هەرگۆڕانکاریووەچەرخێك، لەهەر بوارێك لەبوارەکاندابێ " راستە کاتێکی دیاریکراوو مێژوویەك دەبێتە خاڵی جیاکەرەوەی ئەو گۆرانکارییەلە قۆناغەکانی پێش خۆی" بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، کە ئەو گۆرانکارییە، کاریگەری پێش ئەو مێژووەی بەسەرەوە نەبووە. گۆرانکاریو رەوتی مێژوو زیاتر زنجیرەیەکی بەیەکەوە گرێدراوی نێوان (رابووردوو- ئێستا- داهاتوویە)وەك لەوەی چەند هەنگاوێکی دوور لەیەکدیو بێ کاریگەری قۆناغێك لەسەر قۆناغێکی دیکەبێ. لەسروشتی مرۆڤدا چەندە حەزو ئامادەیی بۆ گۆرانکاری هەیە.

ئەوەندەش حەزوئامادەیی بۆ نە گۆرانو دەستبەردار نەبوونی داب و نەریتە باوەکان هەیە. کاریگەریو چۆنێتی بڵاوبوونەوەی هەر تێزوبیرو بۆ چونێك لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێكو لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی

دیکە دەگۆڕێ. جیاوازیو خاڵی هاوبەشی نێوان ئایینەکان بۆ ئاستی تێگەیشتنو باروبۆخی کۆمەلایەتی لێکچیای کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە.

کاتو شوێنو باروبۆخی لێکجیای ئابووریو کۆمەلایەتی و کلتووری، رۆڵی دیارو ئاشکرایان هەیە لەوەرگرتن یان رەتکردنەوەی هەرتێزو بیرو بۆچونێکدا. وەرگرتنو رەت کردنەوەی ئیسلام یان هەرتێزو بۆچونێکی دیکە بە پێی جیاوازی عەقڵیەتو هەلو مەرجەکان بەرەنجامی جیاجیای لێدەکەوێتەوە. چ ئاین یان هەر بیروباوەڕێك کە زادەو هەڵقولاوی عەقڵو هزری مرۆڤ بێ، رۆڵی هەیە لە گۆڕینی بیرو بۆچونو روانینو هەڵوێستی مرۆڤدا، بەلام هەندێ خەسڵەتی تایبەتیو حالەتی سایکۆلۆژی لەمرۆڤدا بە شێوەیەکی کتوپڕناگۆڕێ. ((مێژوو نووسی فەرەنسی بەناوبانگ (فێردینان برودیل) بۆ تێگەیشتن لە مێژوو باس لەپێویستی لێکدیجیاکردنەوەی خێراییە جیاجیاکانی زەمەن دەکات. بەڕای برودیك چ زلنا کۆمەلایەتییەکانو چ ئەولنەی کەخۆیان بەمێژووەوە خەریك دەکەنو دەخوازن لەدیاردە مێژوویەکان تێبگەن پێویستە خێراییە جیاجیاکانی تێپەڕنی زەمەن لەناو کایە جۆربەجۆرەکاندا لەیەکدی جیابکەنەوە چونکە خێرایی تێپەڕینو جووڵەی زەمەن لەهەر یەکێك لەکایەکانی چالاکیە ئینسانیەکاندا خێراییو جووڵەی جیاوازو تایبەتە. ئەمەش وادەکات توانای خۆتازەکردنەوەو گۆڕان لەهەر یەکێك لەکایانەدا جیاواز بێت لەویدەیکەیان، جوڵەی زەمەن لەکایەی سیاسەتدا جیاوازە لەجوڵەی زەمەن لەکایەی ئابووری دا، گۆڕانەکانی ناو سیاسەت خێراترن لەگۆڕانەکانی ناو ئابووری))[٣]. گەر لەڕوانگەی برودیلەوە بڕوانین، ئەو ڕاستییەمان بۆئاشکرا دەبێ، کەئەو بوارانەی ڕۆشنگەری گۆڕانی تێدا بەرپاکرد، لەیەکێکیانەوە بۆیەکێکی دیکە گۆڕاوەو دەرەنجام

سەرکەوتنەکانیش لەیەکێکیانەوە بۆیەکێکی دیکە بەپێی کاتو هەلو مەرجی جیاواز لەیەکدی جیابوون. هەوڵدانی مرۆڤ بۆگۆرانکاریی‌و چاکسازی زیاتر لەوکاتانەدا دەستی پێکردووە، کەمرۆڤ ڕوو بە ڕووی قەیران‌و تەنگژە بۆتەوە. مەرج نییە گۆرانکاریی‌و نوێخوازی‌و چاکسازی، هەموولایەنەکانی ژیانی مرۆڤ بگرێتەوە، چەندین خەسڵەت‌و تایبەتمەندی کە لە سروشتی مرۆڤدا ڕەگا ژۆیەو بەشێکە لەپێکهاتەی جێگیرو بەردەوامی مرۆڤ، دەستکاری کردنیان نەك هەرەشەیە بۆسەر سروشتی مرۆڤ، بەڵکو دەبێ هەوڵی پارێزگاری کردنیشیان بدرێ. ئەگەر زانست‌و زانیاری‌و پێشکەوتنی زانستە مرۆڤایەتییەکان‌و کردنەوەی زیاتری دەرگاکانی عەقڵ‌و هەوڵدان بۆدۆزینەوەی نهێنیەکانی سروشت‌و بوون، بوویێتە هۆی ئەوەی کەمرۆڤ، دابڕانێکی ئەبستمولوژی لەنێوان دوێنێ‌و ئەمرۆیداو سەردەم‌و قۆناغ‌و سەردەم‌وقۆناغێکی دیکەدا بەرپابکا، ئەوا بەشێك لەو خەسڵەت‌و تایبەتمەندییانەی مرۆڤ بە جێگیری ماونەتەوە. ئەو مرۆڤە نوێیەی ڕۆشنگەری بەدوایدا وێڵ بوو، دواتریش نیتشە سەرلەنوێ مرۆڤی تێك شکاندو بانگەشەی بۆئەوە کرد کەمرۆڤ تێپەڕێندریێ‌و لە سوپەرماندا بەرجەستە ببێ، لەزۆر ڕووەوە لەگەڵ مرۆڤەکەی دوێنێدا جیاوازی نەبوو. هەوڵدانی مرۆڤ بۆگەیشتن بەزانست‌و زانیاری‌و دۆزینەوەی نهێنییەکانی سروشت‌و مرۆڤ، لەهەوڵ‌و ئارەزووی مرۆڤ بۆ دەسەڵات‌و دەستبەسەرداگرتن‌و هەژموون جیانابێتەوە. (محەمەد ئەرگون) دەڵێ:( بێ بەرێتی ( البراءة )ی تەواو لەسەر زەویدا نییە"[٢٢]. ڕۆشنگەری لەگەڵ ئەو ڕووە ڕوشنگەرییەیدا، کە بەهۆیەوە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پێی نایە قۆناغێك‌و مێژوویەکی نوێ‌و چارەسەری زۆر لەوکێشانەی کرد، کەبەدرێژایی مێژوو گرفت بوون لەبەردەم مرۆڤدا،

ناتوانێ خۆی لەو بەرپرسیارێتییە بێ بەری بکا کە لەچەندین چیرۆکی تراژیدیو جەنگو کوشتارو کاولکاریدا خۆی نواند. بزاوتو گۆرانکارییە مێژوویەکان، ئاراستەو خواستو مەبەستی جیاجیان هەیەو لەڕووی چەندێتیو چۆنێتییەوە لێکدی جیان. مەرج نییە هەرگۆرانکارییووەچەرخانو هەوڵدانێك بۆچاکسازیو بەرەو پێشەوە بردنی ژیانی مرۆڤ لەڕووی ئەستوویی (مادد)یو مانایەوە، مرۆڤیان ئاسودە کردبێو بەختیاریان بەدیاری بۆ هێنابێ " بەڵکو زۆر جار دروشمەکان پێچەوانە بوونەوە. ئاکرێ ئەو دروشمە رەخنەییەی رۆشنگەری سەردەمی خۆی پێ خوێندەوە، رۆشنگەریشی پێ نەخوێندرێتەوە. ڕەوتی گۆرانکاریو مێژووی ئاراستەی جیاجیای هەیە، هەندێ جار گۆرانکارییوێرای هەنگاوی چاکسازیو هێنانەدیو دەستەبەر کردنی خواستەکانی مرۆڤ، چەندین گرفتو کێشەومەینەتیش لەگەڵ خۆی دینێ. بزاوتووەچەرخانە مێژووییەکان، چەندە مرۆڤیان دڵنیا کردبێو چارەسەری هەندێك لە گرفتو کێشەکانیان کردبێ "ئەوندەش مەینەتو ئازاریان بۆهێناوە. ئادورنۆ دەڵێ ((مێژوو بزاوتێك نییە لە بەربەریەتەوە بەرەو ئازادی، بەڵکو بزاوتێکە لەتیرو کەوانەوە بۆ بۆمبای ئەتۆمی))[٢٤]. دەشێ تێزو بیروباوەڕێك لەمێژوودا، بەهۆی ئەو دروشمانەی دەیانخاتەڕوو، مایەی سەرنجو ڕا لێ بوون بێ " بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئەم تێزو بیروباوەڕە بتوانێوەڵامگۆی پرسیارەکانی سەردەم بێ. عەتا قەرەداغی دەڵێ: ((لێرەدا ئەو پرسیارە سەرهەڵدەدات بۆچی هەلگرانی پەیامی ئایینی زەردەشتی ئەو ڕوحی قوربانی دانەیان لەپێناوی ئایینەکەیاندا تێدلنەبووە ؟))[٢٥]. لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێ: ((یەکێك لەهۆیە سەرەکییەکانی تێکشکانی

ئایینی زەردەشتی هەر لە گەوهەری خۆیدایە ئەویش لەهەق نەهاتنی وەلامدانــەوەی هــەموو پرســیارەکانی مرۆڤــە ))[٢٦]. پرســیارەکانیش بەئەنــدازەی جیــاوازی ژینگــەو ئاســتی تێگەیشــتن‌و هوشــیاری مــرۆڤ دەگۆڕێن‌و وەلامەکانیش کاردانــەوەو بــەرەنجامی پێداویســتییەکانی ئــەو سەردەم‌و بارودۆخەن، کەکۆمەلگە تێیدا دەژی. هەرسەردەم‌و قۆناغێکی مێــژوویی، خــاوەنی جۆرێـك لەپرسیاری تایبــەت بەخۆیــەتی‌و ئــەو تێــزو بۆچوونانەی بیریارو فەیلەسوفان، لەهەر قۆناغ‌و سەردەمێکی مێژووییدا، بانگەشەی بۆ دەکــەن‌وەلامی جۆرێك لەپرسیاری ســەردەم‌و قۆنــاغێکی دیــاریکراو دەدەنــەوە. زۆر جــاروەلامی پرســیاری کــات‌و قۆنــاغێکی دیاریکراو، بۆ کــات‌و قۆنــاغێکی دوای خــۆی ناشــێ. ئەگــەر ڕۆشــنگەری وەلامــی قۆنــاغێکی دیــاریکراوی مێــژوویی بــووبێ، ئــەوا وەلامــەکانی بۆقۆناغــەکانی دوای خــۆی، پێویســتییان بەســەرلەنوێ پێداچــوونەوەو دەستکاریکردن کرد. ئەمەش پێچەوانەی ئەو متمانەو بــڕوا بەخۆبوونــەی ڕۆشــنگەری بــوو، کەلەســەرەتاکانی دەرکەوتنیــدا بانگەشــەی بۆدەکرد. (محەمەد ئــەرگۆن) باســی پەیوەنــدی نێوان هەریــەك لــەماناو هــەژموون دەکا، کەچۆن هەریەك لەڕۆشنگەری‌و هەلگرانی پــەیامی ئــایین بــەکاریان هێناوە "واتە ململانێیەکە لەپێناوی هەژموون دابووە. لــەململانێی نێــوان کلێساو ڕۆشــنگەریدا، ڕۆشــنگەری‌و عەقلانیــەت ســەرکەوتن. ئەگــەر ئــەم حالەتــە بــەراورد بکــرێ بــەململانێی نێــوان ڕۆشــنگەرانی ئیســلامی‌و دەسەلاتدارانی ئایینی لەمێژووی ئیسلامیدا، یان ململانێی نێوان ئــایین‌و عــەقڵ ئــەوا هاوکێشــەکە لــەجیهانی ئیســلامیدا پێچــەوانە بــۆوە، چــونکە لەجیهانی ئیسلامیدا عەقلانیەت شکەستی هێنا."[٢٧]

ئەگەر لەڕواڵەتدا ئەم دوو ململانێیە لەیەکدی بچن، ئەوا لەناوەڕۆکدا لەیەکدی جیان. ئەو ئایینەی کە عەقڵانییەت لە ئەورووپا ڕووبەڕووی بۆوە، ماناى ڕاستەقینەی ئایینی لەدەست دابوو. لەهەمان کاتدا ئەو عەقڵانییەتە خۆی بە ئەلتەرناتیفی ئایین دەزانیو کاری بۆ ئەوەکرد کە ئایین بخاتە پەراوێزەوە " بەڵام بزاڤی عەقلگەرایی لەمێژووی ئیسلامدا بۆ ئەوە نەبوو، ئایین بخاتە پەراوێزەوە. وەك چۆن هەڵگرانی پەیامی ئایینی لەلایەن ئەو کەسانەی کەپەیامی ئایینییان بەبەڵگەی عەقڵی ڕەتکردۆتەوەو پێیانوابووە ئەوەی ئایین هێناویەتی دژایەتی لەگەڵ عەقڵدا هەیە، بەهەمان شێوە تێزو بۆچوونە عەقڵییەکانیش لەلایەن هەندێك لەهەڵگرانی پەیامی ئایینییەوە ڕەتکراونەتەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە، عەقڵو ئایین ناکۆکن، بەڵکو کێشەکە لەچۆنیەتی مامەڵە کردنی ئەو کەسانەوە سەری هەڵداوە، کەبەهەر پاساوێکەوە بووبێ ویستوویانە کۆسپ بخەنە بەردەم هەنگاوەکانی عەقلگەرایی. ئەگەر کۆمەڵێك لەهەڵگرانی پەیامی مەسیحییەت دژایەتی فەلسەفەی یۆنانیی و ڕۆمانیەکانیان کردبێ، ئەوا چەندانیوەك: تۆماس ئەکینۆسو سان ئۆگستینو سان ئەنسەلەمو. . . . . . چەندانی دیکە هەوڵیانداوە ئایینو فەلسەفە بەیەکەوە بگونجێنن.[٢٨]

لەمێژووی ئیسلامیشدا هەمان دیاردە دووبارە بۆتەوە، ئەگەر کۆمەڵێك هەوڵیاندابێ ئەو دەنگانە بخنکێنن، کەباسی عەقڵانیەتو ڕۆشنگەرییان کردبێ، ئەوا کۆمەڵێکی دیکە بەپشت بەستن بەدەقەکانی ئایین لایەنگری ئەو دەنگانەیان کردووەو نەك هەوڵی عەقڵخوازانییان ڕەت نەکردۆتەوە " بەڵکو هەوڵی گەشە پێدانو سەرخستنی پرۆژە عەقڵانیەکانیان داوە. ئەگەر پرۆژە عەقلگەراییەکەی ئەورووپا بەراورد

بکەین بەپرۆژە عەقلگەراییەکەی جیهانی ئیسلامی " دەبینین هەریەك لەو دوو پرۆژەووەرچەرخانە مێژووییە دەستکەوتی گرنگیان پێشکەش بەمرۆڤ کردووە.

راستە ئەوەی جیهانی ئیسلامی بەپرۆژەیەکی شکست خواردوو ناوزەد دەکرێو نەگەیشتە ئاستی پرۆژەکەی ئەوروپا، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کەبێ بایەخ و بێ دەستکەوت بووە. ئەگەر رێنسانسی ئەوروپا سەرەتاو دەستپێکێك بووبێ بۆ قۆناغی رۆشنگەریو ئەم دوو قۆناغە تەواو کەری یەکدی بووبن، ئەوا قۆناغی عەقلانی لەمێژووی ئیسلامیدا، دوای ئەو شکستەی رووبەرووی بۆوە، نەیتوانی درێژە بە پرۆژەکەی بداو بەردەوامی پێ ببەخشێ. دەبێ پێمانوابێ، کەوەچەرخانو گۆرانکاریی مێژوویی لەم چەشنەی رۆشنگەری ئەوروپا، لەسەر زەمینو کاتی دیکەدا دەرکەوتوون " بەڵام هەلو مەرجو باروبۆخی دژوارو ناهەموار رێگر بوون لەبەردەم ئەم چەشنەوەرچەرخانو گۆرانکارییانەدا.

مەرج نییە ئەو هەوڵانەی بەمەبەستی گۆرانکاریووەرچەرخان ئەنجام دەدرێن، بگەنە ئەو ئاستو مەرامەی هەنگاوی لەپێناو دانراوە، دەشێ لەگەڵ هەر هەنگاوێك رووەو گۆرانو چاکسازی، ئەوە لەبەرچاو بگیرێ کەچەندان کۆسپو لەمپەر دێنەبەردەم. هەنگاوەکانو پرۆسەکە بەئاقارێکی دیکەدا دەبەن. زۆرن ئەو گۆرانکارییووەرچەرخانە مێژووییانەی کە، فەیلەسوفانو روناکبیران رۆڵی دیاو بەرچاویان دیوە لەگەشەپێدانو بەرەو پێشەوە بردنی ئەو بزاڤو گۆرانکاریانەدا " ئەگەر رۆڵی فەیلەسوفانو بیریارانی رۆشنگەری بەراورد بکەین بەهەندێك لەووەرچەرخانو بزافانەی مێژوو، ئەوا رۆڵی فەیلەسوفانی رۆشنگەری

بەوە لەهەندێك لەوانی دیكە جیادەكرێتەوە، كەفەیلەسوف و بیریارانی ڕۆشنگەری لەوكاتەدا گوێیان لێگیرا كە لە ژیاندابوون، لەهەمان كاتدا فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری ئەگەر لەهەندێك بیرو بۆچووندا ناكۆك بووبن ئەوا بەگشتی كۆكو هاودەنگی یەكدی بوون. كۆمەڵگەی خۆرئاوایی لەوسەردەمەدا لەئاستێكدا بوو كە لەزمانی ئەو بیریارو فەیلەسوفانە تێدەگەیشت. ئەم گوێ لەیەكدی ڕاگرتن و لێكدی حاڵی بوونە، یەكێك بوو لەو هۆكارانەی كە ڕۆشنگەرییان بەرەو پێشەوە برد. بەلام كاتێك فارابی و ئیبن سیناو چەندانی دیكە لەجیهانی ئیسلامییدا دەركەوتن و چەندین قوتابخانەو ڕێبازی فیكری و فەلسەفی پەرەیان سەند، كۆمەڵگە لەوكاتەدا، نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی لەزمانی ئەوانە تێبگا.

# گۆڕانکاری عەقلیی

عــەقڵ ئــەو بەخششــەی خودایــە، کــەمرۆڤ بەهۆیــەوە سروشــتو دەوروبەرو خۆیو خودای ناسیوە. مرۆڤوێرای عەقڵ خاوەنی چەندین بەخشــشو تایبەتمەنــدی دیکەیــە، کەهەریەکــەیان ڕۆڵو کاریگــەری تایبەتییان هەیە لەئاراستە کردنی مرۆڤداو سنوورێك بۆ مامەڵەو هەڵسو کەوتو ڕەفتاری مرۆڤ دادەنێنو سەرچاوەیەکن بۆ ئەو زانیارییانەی مرۆڤوەدەستیان دێنێ. ئەو ژینگەو دەوروبەرەی مـرۆڤ تێدا دەژی هـەر لەبەرایی مێژووەوە، مایەی سـەرنجو بیرکردنـەوەی مـرۆڤ بـووەو هـەوڵی تێگەیشـتنو دەسـت بەسـەر داگـرتنو تێپەڕانـدنی داوە. زانیـاریو مەعریفەی مرۆڤ بـەرەنجامی ئەوبەریـەك کـەوتنو مامەڵەکردنـەی نێـوان سروشـتو مرۆڤ بـووە. ئەگـەر لـە قۆناغێـك لـە قۆناغـەکانی مێـژوودا سروشتو دەوروبەر زاڵبوونی خۆیان سەلماندبێو مرۆڤیان خستبێتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە " ئـەوا لەقۆناغـەکانی دیکـەو دوای هـەوڵی نەپساوەی مـرۆڤ بـۆ زیـاتر فراوانکردنـی دەلاقـەکانی تێگەیشـتنو عـەقڵ، زیـاتر سروشـتو دیاردەکـانی دەوروبـەر نهێنییـان ئاشـکرابووەو بـە چـەمکی قورئـانی رام بـوونو دەسـەڵاتو ئـیرادەی مرۆڤیـان قبـوول کـردووە. بیرمەنـدانو فەیلەسـوفان هەریەکـەیان بـەجۆرێك ئـەو پەیوەندییـە لێـك دەدەنـەوە کەلـە نێـوان مرۆڤــو سروشـت دا هەیـە، هەنـدێکیان عـەقڵ بـەهۆکارو ڕەگـەزێکی سـەرەکی دەزانـیٚ کـە مـرۆڤ بەهۆیەوە مەعریفـەو زانیاریوەدەست هێناوەو هەندێکی دیکەوێرای عەقڵ ئەزموونو هۆکاری دیکە بەسەرچاوەی ئەو زانیاریو مەعریفەیە دەزانن. بەچـەمکی هیگڵ، ئـەو کاتـەی مرۆڤ بەشـێك بـووە لـە سروشـتو نـەیتوانیوە لـە ژینگـەو سروشـت تێپـەڕێنێو خـەیاڵو ئەفسـانە پانتـایی عـەقڵی مرۆڤیـان داگیر

کردووە، مرۆڤ لە دەرەوەی مێژوو بووە، مێژوو ئەو کاتەدەستی پێکردووە، کەمرۆڤ خاوەنی خود هۆشیاری بووەو توانیویەتی لە سروشت دابڕێو هەوڵی تێگەیشتنی داوە. قۆناغەکانی هەست کردنی مرۆڤ بەسەربەستی ئەو قۆناغانەی کەبەلای هیگڵەوە، پەیوەندیان بەگەشەی عەقڵەوە هەیەو لەو گەشەیە جیا نابنەوە. عەقڵ لە قۆناغێکدا کە سەربەستە، مانایەکی دیکەی هەیەو بوونی خۆی دەسەلمێنێ. قۆناغە لێک جیاکانی عەقڵ، پەیوەندیان بەو هەستکردن بەسەربەستییەوە هەیە، کەلەهەر یەکێك لەو قۆناغانەدا دەردەکەوێت، تاعەقڵ دەگاتە قۆناغێك کەلە ڕوحی ڕەهاداو لەدەوڵەتدا بەرجەستە دەبێ.[39] هیگڵ ڕەخنە لەوانە دەگرێ، کە هەستو سۆزی ئەوانەی لە دڵەوە سەرچاوە دەگرن، لەعەقڵ جیادەکەنەوە، بەڕای ئەو ئەمانە لەیەکدی دانابڕێن جیاکردنەوەی عەقڵو هەست بەو مانایە نییە کەعەقڵ لەسەرووی هەستەوە نییە، ئەگەر جیاکردنەوەی ئەمانە لەیەکدی هەڵە بێ ئەوا هاوسەنگ کردنیان هەڵەیەکی دیکەیە.[40]

پەیوەندی نێوان عەقڵو هەستەکان، پەیوەندی نێوان قۆناغی ڕوحی ڕەهایە لەگەڵ قۆناغی تری ئەو ڕوحەدا " بۆیە ئەو یاسایانەی کەسەرچاوەکەیان بۆ هەستەکان دەگەڕێتەوە، کۆمەڵ یاسایەکن شکست دێنن، بۆ ئەوەی یاساو ڕەوشتەکانی ناو کۆمەڵ، بگەنە قۆناغی ڕەها دەبێ لەعەقڵەوە سەرچاوە بگرن " چونکە عەقڵ خەسڵەتی گشتی هەیە. ئەگەرچی هەندێك جار مرۆڤ بەهۆی هەستەکانییەوە دەگاتە هەندێك ئامانجو مەبەستی دیاریکراو، بەڵام ئەمە پاساو نییە بۆئەوەی مرۆڤ بەغەریزەکانی ڕەفتار بکا[41].

رۆڵێو گرنگی عەقڵ ئەو کاتە دەردەکەوێ کەملکەچی یاساکان بێ. واتە قۆناغی عەقڵی خودی تێپەڕێنێو بچێتە قۆناغی عەقڵی بابەتییەوە. کاتێك ملکەچیو جێ بەجێ کردنی یاساکان دێتە دی کەمرۆڤواز لەئارەزووە تایبەتییەکانی بێنێ. جێبەجێ کردنی ئەو یاسایانە،ئەو قۆناغانەیە کەمرۆڤ تێدا سەربەست دەبێ. لەو سونگەیەوە سەرپێچی کردنی ئەو یاسایانە لەگەڵ سەربەستیدا ناکۆك دەبێ.

هیگل ئاماژە بۆ ئەوە دەکاکەیاساکانیش هەموویانوەك یەك نین، ئەو یاسایانەی کەدەبنە هۆی چەوساندنەوەو ستەموویستو ئارەزووی چەند کەسێك لەپاشاو دیکتاتۆرەکان دێننەدی، لەم حاڵەتەدا چەمکی سەربەستی دەشێوێو کۆیلایەتی زیندوو دەبێتەوە"". گرنگیو رۆڵی یاسا لەژیانی مرۆڤداو پەیوەست کردنی بەسەر بەستیو قۆناغێکی عەقڵییەوە کەلەسەرووی عەقڵی خودییەوە، رۆڵێو گرنگی ئایین لەژیانی مرۆڤ دا دەسەلمێنێ. سەرجەم ئایینەکانیش یاسایان بۆ مرۆڤ هێناوە، ئەوەی گرنگەو ئایینەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە، جێ بەجێ کردنی یاساکانە. بڕوادار چەندە ئامادەی جێ بەجێ کردنی یاساکان بێو پەیڕەویان لێ بکا، ئەوەندە لەسەربەستی نزیك دەبێتەوە لەو ڕواگەیەوە، کەسێك بڕوا بێنێو یاساکان جێ بەجێ نەکا، لەسەربەستییەوە دوورەو کۆیلەی ئارەزووەکانیەتی. جێبەجێ کردنی یاساو فەرمانەکانی خودا مرۆڤ بەرەو سەربەستی دەبەنو لەکۆیلایەتی ڕزگاری دەکەن. گرنگیو ڕۆڵی یاسایە، کارێکیوای کردوە، کەمرۆڤ کاتێك گوێ ی بۆپەیامی پێغەمبەران ڕانەگرتبێ، بۆخۆی یاسای داناوە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کەمرۆڤ هەرکاتێك یاسای دانا، مانای ئەوەیە گوێ لەیاسای خودا ناگرێ" چونکە مرۆڤ ویڕای ئەوەی کەلەسەری پێویستە گوێڕایەڵی خوداو

پێغەمبەرانی خودا بێ، بۆی هەیە چەندین یاسای تایبەت بەژیانی جیهان دابنێو پەیڕەوییان لێ بکاو لەگەڵ گۆرانکارییەکانی ژیانیدا دەتوانێ یاساکانیش بگۆڕێ.

خودا لەپەیامەکانیدا کەمتر باسی ئەو دیاردانەی بۆمرۆڤ کردووە، کەبە عەقڵو لێوردبوونەوەی خۆی دەتوانێ نهێنییەکانیان ئاشکرا بکا. ئەمەش لایەنە گۆڕاوەکان دەگرێتەوە کە، ئیسلام جەختی لەسەر دەکاو مرۆڤ فێردەکا " کەلەڕێگەی عەقڵو ئەزموونەکانی ژیانەوە، چەندین نهێنیو یاسا بدۆزێتەوە. لەم پرۆسەی چالاکییە عەقڵییەدا کەسی بڕوادار دەتوانێ کەڵك لەهەموو ئەو کەسانەوەربگرێ کەلەبڕواو ئایینـدا یەکناگرنەوەو لەچالاکییەعەقڵییەکاندا هەردوکیان وەك یەك هاوبەشنو بڕوای لێك جیانابێتە ڕێگر لەبەرامبەر هەوڵو کۆششی ئەو کەسانەدا، کەلەڕێگەی عەقڵو ئەزموونەوە، نهێنیو ڕاستییەکانی سروشتو ژیان دەدۆزنەوە. لەمێژووی ئیسلامدا بە بەهانەو پاساوی جۆراو جۆرەوە، سنووری چالاکییەکانی عەقڵ تەسك کراوەتەوەو دەرگا لەسەر عەقڵ داخراوە. لەسەر دەمی پێغەمبەردا (ص) هاوەڵەکانی نەك تەنیا بۆ پرسیارکردن دەربارەی ئایین " بەڵکو بۆ ئەو بابەتانەی کەپەیوەندییان بەعەقڵو هەوڵی مرۆڤ خۆیەوە هەیە دەربارەی ژیانی ڕۆژانەیان دەهاتنە لای پێغەمبەرو پرسیاریان لێ دەکرد. هەتا لەچیرۆکی چۆنێتی موتوربەکردنی دارخورمادا، پێغەمبەر هەروەك لە فەرموودەکەدا هاتووە لەوە ئاگاداری کردنەوە، کەئەمە پەیوەندی بەژیانی ڕۆژانەی ئەم جیهانەیانەوە هەیەو بۆخۆیان باشتری لێ دەزانن. ئەگەر لەو قۆناغەدا، کەپێغەمبەر لەژیاندا بووە، خەڵك پێویستییان بەوە نەبووبێ بە عەقڵی خۆیان مامەڵە لەگەڵ دەقدا بکەن" چونکە پێغەمبەر بۆخۆی دوای هاتنە

خوارەوەی ئایەتەکان بۆی لێکداونەتەوە، ئەوا دوای کۆچی دوایی کردنی پێغەمبەر، دەرگاکانی عەقڵ بۆ لێکدانەوەی دەق ئاوەڵابوون. ئەمەش ڕێگەی خۆشکرد بۆئەوەی چەندین زاناو بیریار لە مێژووی ئیسلامیدا دەربکەونو وەك سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوی یاساکانی ئیسلام پەیڕەویان لێ بکرێ. کاتێك ئەو زانایانە قسەیان دەربارەی ئاین کردووەو دەقەکانی ئایینیان ڕاڤەکردووە، لەپاڵ ئەو باسانەدا چەندین بابەتی دیکەیان پێشکەش کردووە، کەتایبەت بوون بەو داهێنانو ئەفراندنانەوە، کەمرۆڤ بەهۆی عەقڵو بیرکردنەوەی خۆیو دوای هەوڵو کۆششی بەردەوامی لەژیانیدا پێیان دەگاتووەدەستیان دێنێ. ئەم دووڕاڤە کردنە، کەلەیەکدی جیانو هەریەکەیان بنەماو میتودی تایبەتی خۆی هەیە، لەلای خەڵك بەیەکسانییەوە سەیریان کراوەو مامەڵەیەکی بێ جیاوازییان لەگەڵدا کراوە. ئومێد قەرەداغی دەڵێت:((گۆڕان لەسەردەمیوەحییەوە بۆ سەردەمی دوایوەحی دەشێت ناوی بنێین گۆڕان لە چاخی دەقو تاك تەئویلییەوە بۆ چاخی عەقڵو فرە تەئویلی.))[٢٢] داخستنی دەرگاکانی عەقڵ چ لەسەردەمی پێغەمبەرو چ دوای کۆچی دوایی کردنیشی، بەهەر پاساوێکەوە بووبێ، دوورە لەسروشتی ئایینی ئیسلام " چونکە ئایینەکان بەئایینی ئیسلامیشەوە، وەك چۆن مرۆڤ هان دەدەن کەلەڕێگەی بەڵگەو نیشانە هەست پێکراوەکانەوە، لەنادیار بگەنو بیناسنو بە هۆیانەوە لەخودا نزیك ببنەوەو لەدروستکراوەکانی ڕامێنن، بەهەمان شێوە بۆکارکردنو بەجێ هێنانی ئەرکی جێ نشینایەتیو ئاوەدان کردنەوەی زەویو بنیاتنانی شارستانیەتیش، ڕێگە بە مرۆڤ دەدا، لەدەرگاکانی عەقڵ بداو بیانکاتەوە نەك دایانبخات.

لەمێژووی ئیسلامدا، بەتایبەتی لەسەردەمی ئەمەوی‌و عەباسییەکاندا گرنگی دان بەزانست‌و زانیاری‌و فەلسەفە گەشەیان سەند، لەپاڵ زانیارییە شەرعیەکاندا چەندین قوتابخانەی دیکە دەرکەوتن‌و چەندین زاناو فەیلەسوف‌و بیریار، بابەت‌و پرۆژە فەلسەفییەکانیان برەو پێدا. ئەم نەشونماو گەشەسەندنە، پەیوەندی بەفرلوان بوونی شارەکان‌و لەهەمان کاتدا گەشەسەندنی بازرگانی‌و ئابوورییەوە هەبوو" بەلام هەروەك (محەمەد ئەرگون) بۆی دەچێ، جەنگی خاچپەرستان لەلایەك‌و هێرشی مەغۆل بۆ سەر بەغدلو ئێران لەلایەکی دیکەوە ئەم بزاوتەفەلسەفی‌و روناکبیرییەی‌وەستاند.

موسڵمانان‌و دەوڵەتی ئیسلامی ناچاربوون لایەنێکی دیکەی ئیسلام گەشە پێ بدەن کە بیرو ڕایان یەکبخات لەبەرگێکی ئایدۆلۆژیدا بۆ بەگژداچوونەوەی ئەو باروبۆخە[21]. بزاڤی عەقلگەرایی‌و فەلسەفی، کەلەولات‌و ژینگەیەکی‌وەك‌ولاتانی ئەورووپادا زیاتر گەشەی کردو لە جیهانی ئیسلامیدا بە سستی هەنگاوی نا، پەیوەندی بەچەند هەل‌و مەرجێکی سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەلایەتییەوە هەبوو، کە هەر یەکێکیان ڕۆڵی دیارو بەرچاویان هەبوو لە زیاتر دەرکەوتن‌و فورمەلەبوونی دیاردەی ڕۆشنگەری. لەجیهانی ئیسلامیشدا ئامادەیی‌و هەوڵ‌و کۆششی لەم چەشنە هەبووە" بەلام مەرج نییە هەوڵ‌و کۆششی‌و گۆڕانکاری‌و ڕودلوە مێژووییەکان یەك دەرەنجامیان هەبێ. نابێ نکۆڵی لەم ڕاستییەش بکەین، کەلەقۆناغە جیاجیاکانی مێژووی ئیسلامیدا کێشەو ململانێ لەنێوان لایەنگرانی فەلسەفەو ئەولنەی دژیەو ڕەوتە بوون، بزاڤی ڕۆشنگەری‌و عەقلگەراییان دووچاری سستی‌و لاوازی کرد. فارابی‌و غەزالی سەر بەدووڕەوتی لێك جیابوون. بەهەڵە ڕاڤەکردن‌و تێگەیشتنی

دەقـەکانی ئـایین، وەك چـۆن لـە خۆرئـاوا ئاکامەکـەی دژایـەتیکردنی زانسـتو زانایـانی لێ کەوتـەوەو هەرئەوانـەی بـاجی ئـەم بەهەڵـە تێگەیشـتنەیان دا، کـە دژایـەتی زانسـتیان کـردو زانایانیـان ئـازارو ئەشـکەنجەدا. ئـەم حاڵەتـە لـە جیهـانی ئیسـلامیدا بـە جـۆرێکی دیکـە دەرکەوت کە زیاتر لەدژایەتیکردنی فەلسەفەو بیری یۆنانییەکانـدا خـۆی نواند. وەنەبێ زانایانی ئیسلامیو فیکری ئیسلامی بەشێوەیەکی گشـتی لـە سـەنگەری دژایـەتیکردنی فەلسـەفەی یۆنانییەکانـدا بـووبن. بـەڵکو کۆمەڵگـەی ئیسـلامی بـە گشـتیو هەنـدێك لـە زانایـان پشـتیوانی ئـەو رەوتەیان کردووەو لایەنگری بوون. ئەگەر لە هەندێك حاڵەتداوەك یەکیو لێکدی نزیکییەك، لە نێوان جیهانی ئیسلامیو مەسیحی دا لـە کێشـەو گرفتە کاندا هەبێت "وەك (محەمەد ئەرگۆن) بۆی دەچێ، ئەوا دەبێ دان بەو راستییەشدا بنرێت کـە ئـەم حاڵەتـەی جیهـانی ئیسـلامی دەگمـەنو کـەم خایـەن بـووە. ناتوانینوێنـای جۆرێـك لـەو ململانێیـە لـە جیهـانی ئیسـلامی دا بکـەین، کـە لـە نێـوان زانایـانو پیـاوانی کلێسـا، یـان عەقڵوکلێسادا هەبوو، کۆمەڵگـەی ئـەورووپی دووچاری چـەندین گرفـتو قەیران کرد" کە رێگـەی بـۆ رۆشـنگەریو سـەروەرێتی عـەقڵ خۆشـکرد. ناشـێ ململانێـی نێـوان عـەقڵو کلێسـا یەکسـان بکـرێ بـەو حاڵەتـە دەگمەنەی کە هەندێك جار لەمێژووی ئیسـلامیدا، ئـەنجامی بەهەڵـەحاڵی بوون لە هەندێك دەق دەرکەوتووە. ئـەم بەهەڵەحاڵی بـوونو ناکوکییـە نەگەیشـتۆتە ئـەو رادەیـەی کەفشـار بخرێتـە سـەر زانـاو بیریـارو فەیلەسـوفانو دەر بـەدەر بکـرێن، یـانوەك لـەخۆرئاوا بینـرا بکـوژرێن. چەندانیوەك ئـیبن سـیناو فـارابی، گەرچـی لەلایـەن هەنـدێك لـەزانایانی ئیسـلامییەوە دژایـەتییان کرابـێو تێـزو بۆچـوونەکانیان بـەجۆرێك لـە

ناکۆکی لەگەڵ ئیسلامدا لێکدرابێتەوە، لەکۆمەڵگە دەرنەکراون و تەنانەت هەندێك جار بیرو بۆچوونەکانیان بەتێبینییەوە قبوڵکراوە. کەبزاڤی زانستی و فەلسەفی گەشەی نەکرد، لەبەر نکوڵی لێ کردن نەبوو" چونکە لە سەردەمی عەباسییەکاندا، فەلسەفەی یۆنانییەکان وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی. کزبوونی ئەم بزاڤەدوای عەباسییەکان و جارێکی دیکە گەشەکردنەوەی لە خۆرئاوا، بۆچەند هەل و مەرج و هۆکارێکی بابەتی دەگەڕێتەوە. گۆرانکاریی ووەرچەرخانی مێژوویی، دەبێ زادەو هەڵقوڵاوی ئەو گەلو نەتەوەیە خۆی بێ؛ نەك لاسایی کردنەوەووەرگرتنی کوێرانە. هەوڵدانی لەم چەشنە بۆگۆڕینی ڕووخساری مێژوو، پرۆسەی داهێنان سستو لاواز دەکاو دوور دەبێ لەهەر چەشنە داهێنان و گۆڕانکارییەك، ئەمەش بەو مەبەستە نییە کەئەو گەلو نەتەوەیە دەرگا دابخاو پرۆسەی (وەرگرتن و بەخشین) ئەنجام نەدا. کاتێك ڕەسەنایەتی دەستپێکی گۆڕانکارییە، کەباسکردنی ڕابووردوو بەمەبەستی تێپەڕاندن بێ، نەك دووبارەکردنەوە.

بزاڤی ڕۆشنبیری ئێمە بەڕای (جابری) لە شوێندا بەرجەستەبووەو لە کات دابڕاوە. لە دوالیزمی (شوێن/ کات)دا زاڵبوونی شوێن، ئاسۆی ڕۆشنبیری و کلتوری ئێمەی لێڵ کردووە. کە باسی ڕۆشنبیری دەکرێ، کوفەو بەسرەو دیمەشق. . . . . لە هۆشیاری ئێمەدا ئامادەییان هەیە"[۳۰]. ئەمەش بووەتە هۆی نائامادەیی ڕەهەندی کات، کەزیان بەبزاڤی ڕۆشنبیریی هەر گەلو نەتەوەیەك دەگەیەنێ و لەچەند سەردەم و قۆناغی بەیەکەوە گرێدراوی جیادەکاتەوە. ئەم ڕەهەندەونەی کات و سەردەم، یەکێکە لەو قەیران و تەنگژانەی ڕووبەڕووی گەلانی موسڵمان بۆتەوە وەك پێویست مامەڵە لەگەڵ ئەم چەمکەدا نەکراوە.

دوالیزمی (شوێن/کات) ئەو دوالیزمەیە کە جیاکردنەوەیان لەیەکدی زیان بە پرۆسەی بەردەوامی و بزاڤی ڕۆشنبیری و گەشەی هەروەچەرخان‌و گۆڕانکارییەکی مێژوویی دەگەیەنێ. گەڕانەوەی ئێمە بۆ ڕابردوو زیاتر لەژێر فشاری دەرەکیدابووە. هەرکاتێك هەست بەفشاری دەرەکی کرابێ،وەك خۆ دەرباز کردنێك لەو قەیرانە، پەنا بۆ ڕابوردوو براوەو بەوێنەی جوانەوە لەخەیاڵگەی ئێمەدا بەرجەستە کراوەتەوە، لەم حاڵەتەشدا ڕابووردوو نەخوێندراوەتەوە بەمەبەستی تێپەڕاندن[26].
دووبارەکردنەوەی ڕابووردوو، وەك خۆی‌و بەبێ تێپەڕاندن‌و هەڵوێستەکردن لەئاستیدا، عەقڵ‌وبزاڤی‌و ڕۆشنبیری دووچاری قەیران دەکاو داهێنان‌و خستنە سەری نوێ دەخاتە مەترسییەوە. ئاوڕدانەوە لەڕابوردوو، بەپشکنین‌و دۆزینەوەی ڕەهەندە لێك جیاکانی‌و بەراوردکردنی لەگەڵ پرۆسەی بنیاتنانی ئێستادا، لەدەستەوەستانی و لاوازییەکدا خۆی دەبینێتەوە، کەمرۆڤ لە بەرامبەر قەیران‌و ڕوداوەکاندا بێ چارەسەرو خوێندنەوەی دیکە دەهێڵێتەوە. گەشەو بزاڤی مێژوو، زیاتر بەرەنجامی خوێندنەوەی دیکەو ڕوانینی دیکەیە بۆڕووداوو داردەکان. بەختیار عەلی دەڵێ: ((شتەکان لەخۆیانەوە درێژنابنەوە بۆ ئێستا، بتەکان لەخۆیانەوە ناگەنەوە ئەمڕۆ. ئەوەی کە لەڕابووردووەوە دێتەوە، دەبێت بەهانەیەکی هەبێت بۆ هاتنەوە، ئەوەی کەلەقوڵایی زەمەنەوە دێتەوە دەبێت بەهانەیەکی هەبێت بۆ ئەو سنوور برینە، یەکەمجار شتەکان لە ڕێگەی ماناکانیانەوە درێژ دەبنەوە، لە ڕاستیدا ماناسیستەمێکی داخراونیە. . .[27])) مەرج نییە هەر گۆڕانکارییەکی ئەبستمۆلۆژی یان ئەدەبی‌و هونەری ئەو کاتە بەنوێگەر ناوزەد بکرێ، کەلە ڕابووردوو دابڕێ. دەشێ ئەو گۆڕانکاری‌و نوێگەرییە شوێن

پێیەکی لە ڕابووردوو دابڕیو بەبەرگێکی نوێوە بانگەشەی تێزو بۆچوونە نوێیەکەی بکا. گۆڕانکاریو نوێگەری دلخستنی تەولوی دەرگاکانی ڕابووردوو نییە. چەندین دەلاقە هەن بۆ ئەوەی ڕابووردوو لەوێوە جارێکی دیکە سەرەتاتکە بکاو دەربکەوێ. زۆرجار ڕابووردوو دوای سەرکەوتنی ئەو شۆڕشو گۆڕانکارییەی ئەنجام دەدرێ دەگەڕێتەوە. دەتوانین شۆڕشی فەرەنسی بەنموونە بێنینەوە، کەبەشۆڕشێکی ڕادیکاڵی دەژمێرریێ لەمێژوودا، لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی خۆی لە هەژموونی ڕابردوو بپارێزێ. سیستەمی پاشایەتی کەواگومان دەبرا کۆتایی هاتووە، بەڵام بەردەوامی خۆی پاراست[٣٨].

دیاردەی گۆڕانکاری لەهەر قۆناغو سەردەمێکدابێ، ئاسانو بێ گرفت نییە. یەکێك لەتایبەتمەنییەکانی مرۆڤ ئەوەیە، کە بەئاسانیواز لەو یاساو دابو نەریتانە ناهێنێ، کە ماوەیەك کۆمەڵگە پەیرەوی لێ کردوون. کاتێك کۆمەڵێك بانگەشە بۆ تێزێکی نوێ دەکەن، لەبەرامبەردا کۆمەڵێکی دیکە هەوڵی بەرگریکردنو پاراستنی ئەو نەریتو یاسا باوانە دەدەن کە، کۆمەڵگە لەگەڵی ڕاهاتووەو بەشێکە لەخایاڵگەی کۆمەڵگەو بەئاسانی دەستبەرداری نابێ. هەژموونو ئامادەیی ڕابوردوو، لەدوایدا دەبێتە جۆرێك لەخۆشەویستی کە خەیاڵگەو هەستی خەڵك داگیردەکا. ئەو خۆشەویستییە، لەهەندێك حاڵەتدا دەگاتە ڕادەیەك، کەدوای ئەوەی بەچەندین بەڵگە ئەو یاساو نەریتە باولنە ڕەت دەکرێنەوەو دەمامکەکانیان ئاشکرادەکرێن " کەچی لەخەیاڵگەو هۆشی بەشێکی خەڵکدا کاریگەرییان هەر دەمێنێ. نەك هەرئەمە، بەڵکو بەچەندین پاساوی دیکەی داتاشراو، لەبەرگێکی دیکەدا خۆیان نمایش دەکەن. کاتێك پێغەمبەری ئیسلام (ص) بانگەوازی خودای بەخەڵك دەگەیاند،

بەچەندین بەڵگەو نیشانەی خودایی دەیسەلماند کەنێرراوی خودایە، کەچی ئەوەیوای لەبێ بڕوایان دەکرد دژایەتی بکەن زیاتر خوپێوەگرتن و ڕاهاتن بوو لەگەڵ ئەو دابو نەریتانەی خەڵك لەباوك و باپیرانەوە بۆیان بەجێ مابوون. مەرج نییە تەنیا نەزانینو دەرك نەکردنی مرۆڤ بەچەندین دیاردەو نهێنی ژیان و سروشت، هۆیەك بووبێ بۆ بڕوا هێنان و قبوڵکردنی ئەو دیاردەیەو بەپیرۆز تەماشاکردنی، یان بەپێچەوانەوە بۆ بڕوا نەهێنانو نکوڵی لێ کردن. هەندێ جار دوای ئاشکرابوونو دەرکەوتنی ڕاستییەکانیش، مرۆڤ دانی بەڕاستیەکاندا نەناوە، ئەمەش سەرکەشیو ئەو حاڵەتەی مرۆڤ دەردەخا، کەهەندێ جار دەستبەرداری ئەو بڕوایە نابێ،کە دوای ئەوەی بەبەڵگەو نیشانەوە، هەڵەی ئەو بڕوایە ئاشکرا دەبێو، ئەم نکوڵی کردنو دان نەنان بەڕاستییەکاندا بەدرێژایی مێژوو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دووچاری چەندین قەیرانو گرفت کردۆتەوە. ڕاستییەکانی ئایین، کەبەشێکیان پەیوەندییان بە نادیارەوە هەیە، مرۆڤیان ڕووبەڕووی سەرسامیو پرسیاری جۆراوجۆر کردۆتەوە، بەشێوەیەك کەبەئاسانی بڕوا نەکا،وەك قورئان ئاماژەی بۆدەکا، ڕاستیە نادیارەکانیان لەگەڵ ئەفسانەدا تێکەڵ کردووە"[٣٣]. لەهەمان کاتدا بڕوایان بەجۆرێك لەئەفسان هێناوە، کە ئەویش لەنادیاردا بەرجەستە بووە " بەلام بڕوایان بەو نادیارانە نەکردووە، کەپێغەمبەران بە بەڵگەوە ڕاستییەکانیان سەلماندووە. بەڵگەو نیشانەی پێغەمبەران ئەو ڕاستییە نادیارانەیان لەو نادیارانە جیاکردۆتەوە، کە سەرچاوەکەیان ئەفسانەو خەیاڵی مرۆڤ بووە. ئەگەر مرۆڤ لەلایەكویستویەتی ڕاستییەکانی لەڕێگەی عەقڵو بەڵگەوە بۆ ئاشکرابێو بۆ ئەو مەبەستەش داوای لە پێغەمبەران کردبێ پەرەجو(المعجزە)بنوێنن، ئەوا لەهەمان کاتداو لەزۆر

حاڵەتی دیکەدا، جۆرێك لە دوگمایی عەقڵیوای لێ کردووە، کە بەئاسانی دەستبەرداری ئەو ئەفسانەو خەیاڵانە نەبێ، کەلەپێشینانیەوە بۆی ماوەتەوە. چەندە لەمرۆڤدا ئامادەیی زوو بڕوا هێنان هەیە، ئەوەندەش ئامادەیی نکوڵی کردنو دان نەنان هەیە. ئەگەر زووبڕوا کردنو دان نان بەو تێزو بۆچوونانەی مرۆڤ بیستوونی یانوازنەهێنان لەودابو نەریتە باوانەی کەلە پێشینانیەوە بۆی بەجێ ماوەو بووەتە بەشێك لە خەیاڵداتی، مرۆڤیان بەرەو دوگمایی عەقڵی بردبێ، ئەوا بەپێچەوانەوە دان نەنانو درەنگ بڕوا کردن یان ڕەتکردنەوەی ئەو ڕاستیبیانەی پێغەمبەران هێناویانە، یان ئەوڕاستیبیانەی بەرهەمی عەقڵی بیریارو فەیلەسوفان بووە، جارێکی دیکەو بەدیوێکی دیکەدا مرۆڤیان دووچاری دوگمایی و چەقبەستوویی کردووە.

# عەقڵ و غەریزە

ئەگەر غەریزەو هەستو سۆزی مرۆڤ زیاتر لایەنێکی جێگیری مرۆڤ بێ و گۆرانکارییە ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسییەکان، کەمتر کاریگەرییان لەسەر ئەم لایەنەی مرۆڤ هەبێ، ئەوا عەقڵ بەتەنیشت گۆرانکارییە کۆمەلایەتی و مێژووییەکانەوە دەگۆڕێ و لەسنوورێکی دیاریکراوی نەگۆردا نامێنێتەوە. مرۆڤ لەو قۆناغو سەردەمە مێژووییەدا، کە ئاستی پەی پێ بردنی بەدیاردەسروشتی و نهێنییەکان لاواز بووە، وێنای ڕاستەقینەی لەبیرو هزری خۆیدا بۆ ئەو دیاردانە کردووە، کە بنەمایەکی ئەفسانەیی و خەیاڵییان هەبووە. لێرەدا مرۆڤ سنوورێکی لەنێوان ڕاستو هەڵەدا جیانەکردۆتەوەو بەرگی جۆراو جۆری بەچەندین تێڕوانین و تێزو بۆچوونی هەڵەداکردووەو بڕوای پێکردوون. ئەریك فرۆم دەڵێ: ((ئێمە ناتوانین دەرك بە پێداویستیە ڕاستەقینەوواقیعی یەکانمان بکەین، تەنها ئەگەر هۆشیاری ساختەمان نەگۆڕین بۆ هۆشیاری یەکی ڕاستەقینە،واتە ئەو کاتەی کەدەتوانین پەی بەڕاستی ببەین، لەبری ئەوەی بەهۆی خەیاڵ ووەهمەوە ڕاستی یەکان بشێوێنین))[1].

هەوڵی بەردەوامی بیریارو فەیلەسوفان لەمێژوودا، بۆ ئەوەبووە ڕووی ڕاستی دیاردەکان ئاشکرا بکەن و سنوورەکانی نێوان ئەفسانەوواقیع و خەیاڵپڵاوی و ڕاستی لێك جیابکەنەوە. ئەرکی پێغەمبەرانیش هەر ئەوەبووە، بەلام ئەوەی ئەرکی پێغەمبەران لەبیریاران جیادەکاتەوە، ئەوەیە، کە پێغەمبەران نێرراوی خودان و ئەوەی دەیڵێن و بەخەڵکی دەگەیەنن، پەیامێکی خودایە. ئەگەر بیریاران دوای گەشتێکی عەقلانی بەجیهانی بووندا، هەندێك لەنهێنی و ڕاستییەکان ئاشکرادەکەن، ئەوا پێغەمبەران لە ئاشکراکردنی نهێنییەکاندا، پشت بە ئەزموون و عەقلی

خۆیان نابەستن. ئایینیش بۆ ئەوە نەهاتووە، عەقڵ ڕەت بکاتەوە "بەڵکو ئایینوێرای عەقڵی مرۆڤ پەیامێکە ڕێنوێنی عەقڵ دەکاو سنوورێك لەنێوان عەقڵو سرووش (الوحی)دا دەکێشی، تاکوئەم دووکایە هەردوکیان ڕۆڵی تایبەتی خۆیان لە ژیانی مرۆڤدا ببینن. ئەگەر یەکێك لەجیاوازییەکانی نێوان بڕوا دارو بێ بڕوا، لەوەدابێ کەبڕوا دار، بڕوای بەو ڕاستییە نادیارانە هەیە، کە مرۆڤ لەڕێگەی عەقڵو ئەزموونی خۆیەوە نایانناسێو بەهۆی نێرراوەکانی خوداوە بۆی ئاشکرا دەبێ، ئەوا هەردوکیان لەوچالاکییە عەقڵییانەداوەك یەکن، کەبەرەنجامی عەقڵو ئەزموونی مرۆڤن، ئایینەکانیش کەمتر باسی ئەو لایەنەیان کردووە، چونکە ئەمە بەرەنجامی هەوڵو کۆششی مرۆڤە. ئەو متمانەو سەروەرێتییەی لەقۆناغی ڕۆشنگەریدا بەعەقڵ بەخشرا، ئەو سنوورەی بەزاند کەچالاکییەکی مرۆڤ بێ بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکانی ژیانو هەڵچنینی دیوارێك بێ لە نێوان عەقڵو خەیاڵپڵاوی کەپێش ئەو قۆناغە تێکەڵ بووبوون، بەڵکو عەقڵ لەپاڵ ڕاستییە زانستییەکاندا ناوی هاتو بەلۆژیکی ڕەهایی مامەڵەی لەگەڵدا کرا. ئازاد حەمە دەڵێ: ((بەپێی هاوکێشەی فەلسەفی نیچەویست بۆ زانین بەویست بۆ هێز (توانا) یەکسانە، کاتێکیش نیچە ڕەخنە ئاراستەی هیومانیزمی ڕۆشنگەری دەکا بەوە تاوانباری دەکا دەستی لە هاوردنەکایەی شۆڕشی زانستی سەدەی هەژدە هەبووە. ئەو شۆڕشەی دواجار بوو بەدەروازە بۆ بەنێوەندکردنی عەقڵ ))[٦١].

ئەگەرویست بۆ زانینو دۆزینەوەی نهێنییەکانی ژیانو سروشت حەزێکی سروشتی مرۆڤ بێ، ئەوا ڕۆشنگەری بە پشت بەستن بەعەقڵو بەسەنتەر کردنی ئەو عەقڵە ئەوویستو حەزە سروشتییەی گۆڕی بۆ

زانستێك كە لە جیاتی ئەوەی بۆ خزمەتكردنی مرۆڤ بخرێتە كار بوو بەئامرازێك بۆوێرانیو كاولكاری. دەبێ دان بەو ڕاستییەشدا بنرێ كە لەپاڵ ئەو لادانو لە سروشت دەرچوونی ئەو حەزەی زانست، لە چەندین بواری جیاجیادا ئەوویست بۆ زانستە لەخزمەتكردنو بەرەو پێشەوە بردنی ژیانی مرۆڤ دا ڕۆڵی دیارو بەرچاوی بینی. دەتوانین بڵێین كە، سەرجەم ئەو گەلو نەتەوانەی، دەكەونە دەرەوەی سنووری ئەو جوگرافیایەی كە ڕۆشنگەری گەشەی تێداكردو فورمەلە بوو، كەڵكیان لەو دەستكەوتانەوەرگرت. ((چونكە ئەم پرۆژەیە، هەرلەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە، بەجۆرێ هاتۆتە پێشەوە كە چارەنووسی زۆربەی شارستانیەتەكانی بەخۆوە گرێداوە))[١١] وەنەبێ قۆناغی ڕۆشنگەری، كاریگەری شارستانیەتەكانی دیكەی لەسەر نەبووبێو دوور لەكاریگەریو ڕۆڵی شارستانیەتەكانی دیكەو لەوانە شارستانیەتی ئیسلامی، توانیبێتی پێ بنێتە ئەو قۆناغە مێژووییەوە. جگە لەوەی كەگەلو نەتەوەو شارستانیەتەكان، ڕۆڵو كاریگەرییان لەسەر یەكدی هەیە" تەنانەت ئەو گۆڕانكاریوەرچەرخانەی كەگەلو نەتەوەیەكی پێ دەناسرێ، لەڕۆڵو كاریگەری چینو توێژەكانی ئەو كۆمەڵگەیە و هەوڵی لەپێشتری زاناو بیرمەندانی ئەو گەلو نەتەوەیە بە دوور نییە. ڕاستە لەهەندێك حاڵەتدا، كۆمەڵێك دەستە بژێر( النخبە) ڕۆڵێكی دیارو ئاشكرا لەپرۆسەی گۆڕانكارییە كۆمەڵایەتییەكاندا دەبینن، یان تاكێكی ئەو كۆمەڵگە ڕۆڵی لەو پرۆسەیەدا لەوانی دیكە زیاترە. ئەمەحاڵەتێكی تایبەتییە دەنا ((گۆڕانكاری پرۆسەیەكی شارستانیەتیە، هەموو لایەنە بەرهەم هێنو خاوەنوزەو تواناكان بەشداری تێدا دەكەن. ))[١٢].

ئەگەر شارستانیەتی ئیسلامی، شارستانیەتو گەلو نەتەوەکانی دیکەی بەبیرو باوەڕی یەکخوایی (التوحید) دەوڵەمەند کردبیّ و لەو لایەنەوە بەهرەمەندی کردبن، ئەوا شارستانیەتی ئیسلامیش کەڵکی لەهەوڵ و کۆششە زانستیو عەقڵییەکانی شارستانیەتی گەلانی دیکەوەرگرتووە. ئەگەر ڕۆشنگەری سەروەریّتی بە عەقڵ بەخشیو شوێنگەیەکی دیکەی پێ بەخشی کە، لەمەوپێش بە هۆی دوگمایی عەقڵی قەشەو پاپاکانەوە، لێ ی سەندرابۆوە، ئەوا لەهەمان کاتدا، زیادەڕەویی کردن، لەو سەروەرێتی پێ بەخشینەدا، عەقڵی بەرەو سەرەڕۆیی برد، لە دوالیزمی (عەقڵ / مورال) دا، عەقڵ پانتاییەکی وای بۆ مورال نەهێشتەوە، بەمەش عەقڵ دووچاری چەندین کارەساتو ڕووداوی دڵتەزێن بوو. فاروق ڕەفیق دەڵێ: ((ڕۆشنگەری لە ڕاستیدا تاریکترین چرکەساتی مێژووی بەشەرییە، مۆتوری ئەم پرۆژەیە جیاکردنەوەی عەقڵە لە عەقڵی فەعال INTELLECT کە ڕەهەندە ترانسێندتاڵەکەی عەقڵە))[١٦].

هەر بەتەنیا عەقڵ نییە، کە مرۆڤ دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە " بەلکووێڕای عەقڵ، مرۆڤ خاوەنی غەریزەو هەستو سۆزیشە، کەهەریەکەیان لەپاڵ عەقڵدا شێوازی هەڵسوکەوتو چۆنێتی ڕەفتاری مرۆڤ دیاری دەکەن. ((ڕاستە عەقڵ پانتاییەکی دیاری لە مێژوو داگیرکردووەو ڕۆڵی خۆی بینیوە لەگۆرانکارییە مێژووییەکاندا " بەلام ئەگەر باسی سنوورو دەسەلاتی عەقڵ بکرێ ئەوا لە گرنگی عەقڵ کەم ناکاتەوە. کاتێك (هیگل) مێژوو بەعەقڵ دەسپێرێ، هێرش دەکاتە سەر ئەو کەسانەی کەپەنا بۆ سروش(الهام)و هەستو سۆزو دڵ دەبەنو گرنگی بەعەقڵ نادەن.))[١٧] .

عەقڵ ئەو پێدراوەیە، کەڕێگەی لەبەر دەم مرۆڤـدا خۆشـکردووە، بۆ زیاتر گەیشـتن بـەو ئامـانجو مەبەسـتانەی، کەبـە درێـژایی مێـژوو، مـرۆڤ هـەوڵی بۆ داوە. لەهـەمان کاتـداو بـەدیوێکی دیکـەدا، مـرۆڤ لەبەرامبـەر دەستکەوتو داهێنراوە عەقڵییەکانیدا دووچـاری نـامۆیی بۆتـەوە. بۆیـە نـاکرێ متمانـەو سـەروەرێتی بەخشـین بەعـەقڵ، سـنووری لەمپـەرێك بـن لەبەرامبەر رەخنەو تێبینی لەسەر عەقڵ. نابێ ڕووە ڕۆشنو گەشـەکەی عـەقڵوامان لێ بکـا، ڕووە تاریـكو نارۆشـنەکەی نـەبینین. ئـەم جـۆرە تێگەیشـتنە، لەئەگـەری ئـەو خۆشـباوەڕیو متمانەیـەمان دەپـارێزێ، کەعـەقڵ بـەرەو سـەرەڕۆیی دەبـا. ئەگـەر فەیلەسـوفانی ڕۆشـنگەری لەبەخشینی جۆرە پیرۆزییـەك بەعەقڵدا زیـادە ڕەوییـان کردبـێ، ئـەوا بەپێچەوانەوە، لەکلتوری ئـەو گـەلو نەتەوانـەدا کـە متمانـەیان بەعـەقڵ نەبووەو بەگومانەوە لە ئیرادەی مرۆڤیان ڕوانیـوە، کـە ئەمـە خەسـڵەتی قۆناغی پێش ڕۆشنگەری ئەورووپاش بووە، عەقڵ شوێنگەی ڕاستەقینەی خۆی لەدەست داوەو ئەمەش بووەتـە هـۆی چـەندین قـەیرانو تەنگـەژە کەڕوو بەڕووی ئەو گەلانە بۆتەوە. لەکلتوری ئەو گەلو نەتەوانەدا، عەقڵ نـەك سـەروەرێتی پـێ نەبەخشـراوە، بـەڵکو بەچـەندین پاسـاوی جـۆراو جۆرەوە، ڕوخساری شێوێنراوەو ڕوخسەتی پێ نەدراوە لـە چوارچێوەو سنووری دیاریکراوی خۆیدا چالاکانە ئەرکی خۆی جێ بەجێ بکا.

# عەقڵی گەردوونیی

هەرلەوکاتەوە کە مرۆڤ، لەو سروشتو دەوروبەرو ژینگەیەی کەتێیداژیاوە، وردبۆتەوەو لە دەرگای پرسیارەکانی دلوە، ئاستی هۆشیاری مرۆڤ پەیوەندی نێوان مرۆڤو سروشتی دیاری کردووە. ئەو پەیوەندییەش بەئەندازەی گۆڕانی هۆشیاری مرۆڤو ئەو قۆناغە لێك جیایانەی کە مرۆڤ لەڕەوتی شارستانیانەی خۆیدا بڕیویەتی، گۆڕاوەو لەشێوازی جیاجیادا بەرجەستە بووە. (مێراقلیتس) هەروەك مێژوونووسانی فەلسەفە باسی دەکەن، یەکەم کەس بووە بیرۆکەی اللوغوس logos : (العقل الكونی): (عەقڵی گەردوونی)، ووروژاندووە. ئەم فەیلەسوفە لەو بڕوایە دابووە، کەیاسایەکی گشتیو هەمەلایەنی، ئەم سروشتە بەڕێوە دەبا(٦).

مرۆڤیش بەشێکە لەویاسا گەردوونییە، یان لەو عەقڵە گەردوونییە، کەڕۆڵی هەیە لەڕێکخستنی یاساکانی سروشتدا. کاتێك مرۆڤ بەشداری لەو عەقڵە گەردوونییەدا کرد، دەتوانێ زانیاری دەربارەی سروشتوەدەست بێنێ. ئەم عەقڵە گەردوونیو هەمەلایەنە، لەلای (هیراقلیتس)، ڕووناکییەکی خودایە، کەئەم بوونەوەرەو پەیوەندی نێوان بەشەکانی ڕێك دەخا. (ئەنکساجوراس) هەمان بیرۆکەی هیراقلیتس بەکەمێك جیاوازییەوە دەردەبڕێ. ئەویش بڕوای بەو عەقڵە هەمەلایەنە، یان گەردوونییە هەیە کەبە (Nous، نوس) ناوی دەبا، بەڵام لەگەڵ سروشتدا تێکەڵ نییە، لێرەدا لە هیراقلیتس جیادەبێتەوە، کە پێی ولیە سروشتو عەقڵی گەردوونیی ئاوێتەی یەکدین. هەردووکیان لەسەر ئەوە کۆکن، کەعەقڵی گەردوونیی ڕۆڵی هەیە لەڕێکخستنی سروشتو مرۆڤیش لە ڕێگەی عەقڵی خۆیەوە، ئەم عەقڵە دەناسێ.

جیاوازی تێڕوانینی هەریەك لە ئەنكساجوراس و هیراقلیتس، دەربارەی پەیوەندی نێوان عەقڵی گەردوونی و مرۆڤ، هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێ كەعەقڵ و سروشت لەفەلسەفەی یۆنانیدا، جێگەیەكی دیاری هەبووە. تێڕوانینی یۆنانیەكان لەبارەی پەیوەندی سروشت و مرۆڤەوە، كاری كردە سەر بیریارو فەیلەسوفانی خۆرئاوا، چەمكی مرۆڤ و سروشت و پەیوەندی نێوانیان لە فەلسەفەو فیكری خۆرئاوادا ڕەنگی دایەوە.

دیكارت عەقڵ و سروشتی لەیەكدی دابڕی، لەكاتێكدا یەكێكی وەك سپینوزا ئەو ڕەخنەیە ئاڕاستەی دیكارت دەكا كەشێوەو ناوەڕۆكی لەیەكدی جیاكردۆتەوە. بەڕای سپینوزا نابێ ئەم دووانە لەیەكدی جیابكرێنەوەو پێی وایە جیاوازی نێوانیان، بەرەنجامی هەست نەكردنی مرۆڤە بەو عەقڵە گەردوونییەی كەبەسەر سروشت و مرۆڤدا زاڵەو فەرمانڕەواتییان دەكا. ئەم تێزو بۆچوونەی یۆنانیەكان، نەك تەنیا لەتێڕوانین و فیكری دیكارت و سپینوزادا ڕەنگی دایەوە، بەڵكو لەسەر زاری چەندین بیریاری دیكە ئەم تێزە بە شێوازی جۆراو جۆر گوزارشتی لێكراوە. ئەگەر فەیلەسوفانی خۆرئاوا هەوڵیاندابێ خۆیان لەكاریگەری فیكرو فەلسەفەی یۆنانییەكان ڕزگاربكەن و تێزو بۆچوونی تایبەت بەفیكرو هزری خۆیان پێشكەش بكەن، ئەوا لەهەندێك قۆناغی مێژوویدا، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، گەڕاونەتەوە بۆفیكری یۆنانی. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ، كەنەیانتوانیبێ دابڕانێك لەنێوان خۆیان و فەلسەفەی یۆنانیدا بەئەنجام بگەیەنن. وردبوونەوەو هەوڵدان بۆ ناسینی سروشت و لێكدانەوەی بوون، لەلایەن بیریارو فەیلەسوفانەوە، بەڕوانین و بیرۆكەی جیاجیا گوزارشتی لێكراوە. كانت پێی وایە، مرۆڤ بەهۆی ئەزموون و ئەو هەستەی هەیەتی، تاسنوورێكی دیاریكراو سروشت و

شتەكان دەناسیّو ئەمەش لەدواییدا دەبێتە ئەو مەعریفەیەی كەمرۆڤ بەدەستی دێنیّ. ئەم ناسینە تەنیا ڕواڵەتی شتەكانە " چونكە عەقڵی مرۆڤ، لەوتوانایە بەدەرە كە خودی شت (الشيء في ذاته) بناسیّ، ئەوەی دەیناسیّو پەی پیّ دەبا، تەنها ڕواڵەتی شتەكانە. بەڵام هیگل بەپێچەوانەی كانتەوە ڕواڵەتو خودی شتەكان لەیەكدی. جیاناكاتەوەو پێی وایە یەكیەتییەكی پتەو لەنێوان ڕواڵەتو خودی شتەكاندا هەیە"[٢٧].

پەیوەندی مرۆڤو سروشت، تەنها بۆ دەستبەسەرداگرتن، یان ڕزگاربوونی مرۆڤ لەهەژموونی سروشت نییە " بەڵكوویڕای ئەمە، سروشتوەك سەرچاوەیەكی مەعریفەو لێكدانەوە لەلایەن مرۆڤەوە، مامەڵەی لەگەڵداكراوەو حەزی مرۆڤ بۆ زانینی زیاترو دۆزینەوەی نهێنییەكانی ژیان، بەهۆی سروشتەوە بووەو بۆ تێگەیشتن لەم سروشتەو گەیشتن بەڕاستیو نهێنییەكانی ناوی جگەلە ئەزموونو عەقڵی خۆی هەندیّ جار گویّ ی بۆ ئەو پەیامانەش ڕاگرتووە كە خودا دەربارەی سروشتو بوونو چارەنووسی ئێستاو ژیانی دوای ئەم جیهانە بەرەوانەكراوەكانیدا بۆی ناردووە. هەندیّ جاریش وێڕای عەقڵو ئەزموونی خۆیو ئەووزەو توانایەی بۆ ناسین هەیەتی، گویّ ی لەپەیامی پێغەمبەرانیش گرتووەو بڕوای پیّ هێناون. ئەم بیركردنەوەو ڕامانەی مرۆڤ، گەر بەبیّ ڕێنیونییەك كەلەسەر ڕووی عەقڵو ئەزموونی خۆیەوە بوونیّ " ئەوا مرۆڤی لەبەرامبەروەڵامی جۆراو جۆردا، دووچاری سەرسامیو گومانو ڕاڕایی كردووە. ئەو ڕاسپاردەیەی پێغەمبەران گەیاندوویانە، بۆوەڵامی ڕاستی ئەو پرسیارانە بووە كە مرۆڤ دەربارەی خوداو بەدیهێنەری بوون، لەئاستی عەقڵو هزریدا سەرەتاتكەی كردووە. ڕاستە مرۆڤ، هەروەك ئادرنۆ[٢٨] پێی وایە بەهۆی زانستو تەكنیكەوە توانی دەست بەسەر

سروشتدا بگرێو عەقڵیش وەك ئامرازێك بۆ ئەو مەبەستە بەكاربێنێ " بەلام هەر هەمان عەقڵو زانستە بووە هۆی گرفت لەبەردەم مرۆڤداو دواجار عەقڵ لەبەرامبەر ئەو پرسیارانەی مرۆڤ ڕووبەڕووی كردنەوە، سەروەرێتی خۆی لەدەستداو زانستیش كەبەرهەمی عەقڵە، نەیتوانی لەبەرامبەر ئەو تاوانانەدا بێ لایەن بێ كەلەئەنجامدانیاندا عەقڵ بەرپرسیار بوو. نابێ ئەمەشوا لێكبدرێتەوە، كەباسكردنی تاوان بەتەنیشت عەقڵەوە، لەڕۆڵو بایەخی عەقڵ كەم دەكاتەوە " چونكە هەروەك متمانەو سەروەرێتی بەخشین بەعەقڵو ڕەهاكردنی، لەئەگەری ئاكامی خراپ بەدوور نییە، بەهەمان شێوە رەخنەو تێبینیو قسەكردن لەسەر ڕووەتاریكەكەی عەقڵ نابێ بۆلەدەستدانی ئەو متمانەیە بێ كەلە سنووری دیاریكراوی خۆیدا پێویستە بەعەقڵ بدرێ.

چالاكییەعەقڵییەكان دوور لەپرانسیپو مورال كە، بەهۆیانەوە ئەركو ڕۆڵی خۆیان وەك پێویست دەبینن، لەئەگەری بەخراپ بەكارهێنانو لادان بەدوورنین. دوور لەو موڕالو پرانسیپە عەقڵ شوێنگەی تایبەتی خۆی لەدەست دەداو مرۆڤوەك بوونەوەرێكی غەریزی دەمێنێتەوە. مرۆڤ بەردەوام هەوڵی داوە، لەرێگەی عەقڵەوە كۆنترۆڵی غەریزەكانی بكاو سنوورێكیان بۆ دابنێ. لەبنیاتنانی ژیارو شارستانیەتیدا، ئەوەندەی عەقڵ ڕۆڵو كاریگەری دیاروبەرچاوی هەیە، غەریزە ئەو ڕۆڵەی نییە، گەرچی مرۆڤ بەشێوەیەكی سروشتیو غەریزیش حەزی لەپرۆسەی بنیاتنانی ژیارو شارستانیەتی بێ. هەروەك د. عەبدولكەریم سروش بۆی دەچێ، پرۆسەی بنیاتنانی ژیارو پرۆسەیەكی عەقڵانییە[61]. جیاوازی ئەو قۆناغەی كە مرۆڤ ژیاری بنیاتناوە، لەگەڵ قۆناغی ژیانی مرۆڤ لەپێش ژیاردا، پەیوەندی بەچۆنێتی مامەڵەی عەقڵو غەریزەكانی مرۆڤەوەیە.

کاتێك مرۆڤ غەریزەکانی دوور لەپرۆسەی عەقڵانیەت بەکارهێنابن، ئەوا لەقۆناغێکدا بووە کەهێشتا ژیار بەشێك نەبووە لەبونیادی کۆمەڵگە. چەندە ژیار لەعەقڵانییەتەوە نزیکەو کۆکەلەگەڵیدا، ئەوەندەش لەغەریزەکانەوە دوورەو ناکۆکەلەگەڵیاندا. دوالیزمی عەقڵ‌و ژیار، یەکێکە لەو دوالیزمانەی، کەیەکێکیان تەولوکەری ئەوی دیکەیە، ئەمەش بەومانایە نییەکە ژیار تەنیا بەعەقڵ‌و دوور لە ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی دیکەی ژیار بتوانێ دەستەبەری ژیارێکی سەرکەوتووبکا.

کاتێك عەقڵ دوور لە هەر پرانسیپ‌و موراڵێك چالاکییەکانی ئەنجام دا ئەوا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بێ، دەبێتە میکانیزمێك بۆ جێ بەجێ کردنی خواستی غەریزەکان. ئەمەش بەو مانایە نییە، کە پێداویستی‌و خواستە غەریزییەکان گرنگی‌و بایەخیان نەبێ " بەڵکو مەبەست لەوەیە کە هەر تواناووزەو چالاکییەکی مرۆڤ، پێویستە لە سنووری دیاریکراوی خۆیدلو بەپێی میتودێك ڕێك بخرێ، کە شایستەی ئەو بەهاو ڕێزو شوێنگەیە بێ کە مرۆڤ لەنێوان بوونەوەرەکانی دیکەدا پێی بەخشراوە. بڕواو متمانەی بیریارو فەیلەسوفان بەعەقڵ لە قۆناغی ڕۆشنگەریدا، کارێکی‌وایکرد، کە جگەلەلایەنە ڕۆشنەکەی عەقڵ، ڕووی دووەمی عەقڵ نەبینن‌و پێیان‌وابوو هەر لەڕێگەی عەقڵی مرۆڤ خۆیەوە ئەو موراڵە دێتەبەرهەم، کەنەك تەنیا لەجوغرافیای خۆرئاوادا، ڕێزو شوکر بۆ مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە " بەڵکو ئەو ڕەهەندەیان بەعەقڵ بەخشی کەبتوانێ مرۆڤ بەرەو گەردوونیی بەرێو لەم ڕووەوە، چەندان بیرمەند جەختیان لەسەر عەقڵی گەردوونیی‌و مرۆڤی گەردوونیی دەکردەوە. (مەریوان‌وریا قانع) دیدگای ڕۆشنگەرلن بەرامبەر بەعەقڵ بەم شێوەیە باس دەکا. (عەقڵ شتێکی گەردونییەو لەهەر جێ‌و شوێنێك بێت هەمان

شتە، بۆیە دەشێت لەسەر بنەمای ئەم پرنسیپە گەردونییە هەموو جیهان ببێت بەیەك ئینسان‌وەك هاولاتیەکی جیهانی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، نەك‌وەك ئەندامی نەتەوە یان دەوڵەتێکی دیاریکراو. ناسیونالیزمی پەرگرو جینوسایدە هاوچەرخەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم ئەم خۆشبینیەی ڕۆشنگەریان بۆ جاری چەندەهەم بەدرۆخستەوە)[٢٠].

مێژووی بیرۆکەی مرۆڤی گەردوونی، لەوکاتەوە دەست پێدەکا، کە پێغەمبەرانی خودا مرۆڤیان بۆبەندایەتیکردن‌و گوێڕایەڵی خودای تاك‌و بێ هاوتا بانگ کردووەو لەچوارچێوەی ئەو پەیامە خوداییەدا مرۆڤ هەست دەکا، کەلەدەرەوەی سنوورەکانی ڕەگەزو چین‌و توێژوو نەتەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ. ئەگەر عەقڵ ئەو پێدراوە بێت، کەلەسنوورو تخوبەکانی خۆیدا بەهانای مرۆڤەوە بێ، بۆدەرباز بوون لەو گرفت‌و کێشانەی ڕووبەڕووی دەبێتەوەو لەزاڵبوون‌و دەسەلاتی سروشت بیپارێ، ئەوا بەتەنیا ناتوانێ ئەو ڕەهەندە بەمرۆڤ ببەخشێ کە لە گەردوونیدا خۆی دەبینێتەوە لەمەترسی ناسیۆنالیزمی پەرگیرو چەندین تێزی دیکەی مەترسیداری بپارێزێ. مەرج نییە ئەو مرۆڤە گەردوونییە دەست بەرداری ناوچەو زێدوولاتی خۆی بێ، دوالیزمی ناوچەیی (لوکاڵی)/ گەردوونیی " دەشێ دوالیزمێك بێ، یەکێکیان هەوڵی سڕینەوەی ئەوی دیکە نەدات. چونکە مرۆڤ بەسروشت چەندە خاوەنی حەزو ئارەزووی تایبەتییە، چەندین ڕێگەی دیکەشی لەبەردەمدان کەبەکەسانی دیکەو هاوڕەگەزەکانی خۆیەوە دەبەستێتەوە. مرۆڤ چەندە لەو زێدو شوێنگەییەی تێیدا دەژی‌و کلتوورو ڕابردوویەك بەو شوێن‌و زێدەیەوە گرێ دەدا، ئەوەندەش حەزی بینین‌و ئاشنایەتی لەگەڵ‌و شوێن‌و

جێگاکانی دەرەوەی خۆی هەیە. بەرهەمی کەم شاعیرو نووسەری ناوداری جیهانی هەیە، خۆشەویستی زێدو خاکو نیشتمانیان لەگەڵ چەمکە گەردوونیو بەها مرۆڤایەتیەکان ئاوێتە نەکردبێ. مرۆڤ بە سروشت هەوڵ دەدا لە هاوڕەگەزەکەی خۆی نزیک بێتەوە، باسکردنی مرۆڤی گەردوونی، یان فکرو تێزێك کە سەرجەم مرۆڤایەتی لەخۆ بگرێو برایەتیو هاوسۆزی لەنێوان مرۆڤەکاندا بێنێتەدی، جگەلەوەی کە پانتاییەکی زۆری لەئاییندا گرتۆتەوەو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) بانگەوازیان بۆکردووە، بیریارو فەیلەسوفانیش بانگەشەی تێزی مرۆڤی گەردوونییان کردووەو هەوڵیانداوە لەسنوورەکانی جوغرافیاو نەتەوە تێپەڕێنن، هەوڵی مارکس بەبێ لەبەر چاوگرتنی سنوورەکانی جوغرافیاو جیاوازی نەتەوەییو کۆکردنەوەی کۆمەڵگە لەدووچینو بەخشینیوێنەیەکی بەردەوامی ململانێش بەدووچینە، هەوڵێکی لەم چەشنەبوو. لێکچوونی بەشێك لەفۆلکلۆری گەلانی جیهان، گوزارشتە لەوێکچوونو لێك نزیکییەی کەلە عەقڵو خەیاڵدانو بیرکردنەوەی نێوان مرۆڤەکاندا هەیە، ئەگەر بەتەنیشت ناوی ڕۆشنگەرییەوە، ناوی عەقڵو مرۆڤی گەردوونیی دێڕووەك دەرکەوتەیەکی ئەو قۆناغە سەیری دەکرێ، مانای ئەوە نییە، مرۆڤ پێش ئەو قۆناغە بەو شێوەیە بیری نەکردۆتەوە. ئەگەر لەچەند قۆناغێکی مێژوییو بەهۆی چەند هەلو مەرجو بارودۆخێکەوە، مرۆڤ بیرۆکەی لوکاڵیەتیو پابەندبوون بە جوگرافیایەکی تەسکی لەلا بەرجەستە بووبێ؛ مانای ئەوەنییە، ڕەهەندی گەردوونیو جیهانی لەمرۆڤدا ئامادەیی نییە. لەهەمان کاتدا، گەر بەهۆی هەمان هەلو مەرجو بارودۆخ لە سەردەمێکدا بیرۆکەی عەقڵو مرۆڤی گەردوونیی گوتاری زاڵ بووبن، ئەوە ئاگەیەنێ کە، تێزو

بڕۆکە لوکاڵیو ناوچەییەکان کۆتاییان پێ هاتبیو ئامادەییان نەبووبێ.
سەردەمو قۆناغەلێك جیاکان، شوناسو پێناسەی جیا بەعەقڵ دەبەخشن. ئەو شوناسەی عەقڵ لە قۆناغی پێش ڕۆشنگەریدا هەیبوو، لەو شوناسە جیابوو کە ڕۆشنگەری پێی بەخشی. ئەگەر لە قۆناغی پێش ڕۆشنگەریدا سنوورەکانی نێوان عەقڵو ئەفسانەو خەیاڵپڵاوی (الوهم) کاڵ بووبنەوە، ئەوا یەکێك لەئەرکە گرنگەکانی ڕۆشنگەری تۆخ کردنەوەی ئەو سنوورانە بوو.

سروش (الوحی) خودایی، کە بۆسەرجەم مرۆڤایەتی بەهۆی نێرراوەکانی خودا ڕەوانەکراوە، ڕەهەندێکی گەردوونی هەیە، هەرچەندە لەگەڵ هاتنەخوارەوەی ئەو پەیامەخوداییانەدا، لەگەڵ عەقڵدا ڕووبەڕووی ململانێ بوونەتەوە، لەهەمان کاتدا ئەو ڕەهەندە گەردوونییەی لە عەقڵدا بەرجەستەیە، لەگەڵ ڕەهەندە گەردوونییەکەی سروشدا یەکیان گرتۆتەوە، ئەمەش یەکێك بووە لەو هۆکارانەی کە کۆمەڵێك بڕوا بەو پەیامانە بێنن، لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆمەڵێکی دیکە ڕەتیان کردوونەتەوە. ئەگەر مرۆڤ خاوەنی ئەو خەسڵەتو تایبەتمەندییەی بێ کە ئەوەی لەدەرەوەی عەقڵی خۆیەتی قبوڵی نەکاو ڕەتی بکاتەوە، لەهەمان کاتدا خاوەنی ئەو خەسڵەتەشە، کە ئەو تێڕو بڕوایانە قبوڵ بکا کە لە دەرەوەی عەقڵن. ئەگەر لەلایەك سروشی ڕەتکردبێتەوە، ئەوا لەلایەکی دیکە قبوڵیکردووە. ئەگەر لەسەردەمێکدا ئەفسانەی لەدەرەوەی سنووری عەقڵ خواستبێو بڕوای پێ کردبێ " ئەوا لەسەردەمو قۆناغی دیکەدا ڕەتی کردۆتەوە، وەك لەقۆناغی ڕۆشنگەریدا. عەقڵ لەسەرەتادا لەگەڵ ئەو سروش (الوحی) خوداییەدا لەناکۆکیدابووە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کەخەڵك داوای

پەرەجو(المعجزە) لەپێغەمبەران بکەن. محەمەد شبستەری باسی سێ قۆناغی لێك جیای پەیوەندی نێوان عەقڵ و سروش (الوحی) دەکا، لەمێژووی خۆرئاوادا، لەوبارەوە دەڵێ: ((لەمەعریفەی عەقڵی مرۆڤدا بۆخوا، جوڵاندن و کێشکردن نییە، بەو شێوەیە نییە کە سەرلنسەری بوونی مرۆڤ بۆلای خاڵێکی مەرکەزی کێش بکرێت، بەلام وەحی عیسایی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کەئەو دەورە جێ بەجێ دەکات))[٣٠].لە ئایینی مەسیحیدا، وەك سەرجەم ئایینەکانی دیکە، دوو دیدگا هەیە بۆ ناسینی خودا، یەکێکیان سروش و ئەوەی دیکە عەقڵ. هەندێك لە زانایانی مەسیحی لەوباوەڕەدابوون، کە ناسینی خودا پرۆسەیەکی سروشیانەی دوور لەعەقڵەو عەقڵ دەستەوەستانە لەبەرامبەر ئەو کردەوەیەدا. هەندێکی دیکەشیان بەپێچەوانەوە بیریان دەکردەوە. ئەگەر لەسەرەتادا ناکۆکی نێوان عەقڵ و سروش توندبوویێ و دوای ئەوەی خەڵك داوای بەڵگەی عەقڵی و پەرەجو( المعجزة )یان لەپێغەمبەران کردبێ، ئەوا لەدوابیدا ئەو ناکۆکییە کۆتایی پێ هاتووەو پەیوەندییەکە ئاسایی بۆتەوە. عەقڵ بەتەنیا بەس نییە بۆئەوەی مرۆڤ بەسروشی خودایی ئاشنا بکا " بۆیە مرۆڤویرای عەقڵ بەدوای سەرچاوەی دیکەدا گەڕاوە بۆئەوەی بەسروش ئاشنابێ و بیناسێ. ئەگەر بۆتێگەیشتن و ئاشنابوون بە سروش، حاڵەتێك لەکێش کردن و کردەیی و جوڵان پێویست بێ، ئەوا عەقڵیش یەکێکە لەو ڕێگەو هۆکارانەی کە مرۆڤ بەسروشی خودایی ئاشنا دەکا. دەشێ هەندێ کەس بەهۆی عەقڵ و بەڵگە عەقڵییەکانەوە بڕوا بەسروش و پەیامی خودایی بێنن و قبوڵی بکەن، دەشێ هەندێکی دیکە بەوەندەوازنەهێنن، بۆیە داوای پەرەجو ( المعجزة ) یان لەپێغەمبەران کردووە، دەشێ هەندێکی دیکە بەهۆی زاڵبوونی هەست و سۆز و

ئـەزموونێکی تایبـەتی ژیانیانـەوە قبوڵیـان کردبـێ. پەیوەنـدی نێـوان سـروش و عـەقڵ لەیەکێکـەوە بۆیـەکێک و لەکۆمەڵگەیەکـەوە بـۆ کۆمەڵگەیەکی دیکەو لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێ. ئەگەر بڕوا هێنـان بـە جۆرە دیـاردەو تێـزو بۆچوونێك لـە قۆناغێك لـە قۆناغـەکانی مێـژووی مرۆڤـایەتیدا، عـەقڵ قبـوڵیکردبێ، ئـەوا هـەمان دیاردەو تێـزو بۆچـوون لـە قۆناغـەکانی دیکـەی مێژوویـدا عـەقڵ ڕەتـی کردۆتەوە. یاساو دابو نەریتە باوەکانی کۆمەڵگەیـەك، کـە لەلایـەن ئـەو کۆمەڵگەیـەوە بەعـەقڵانیکراون و جـۆرە پیرۆزییـەکیان پـێ بەخشـراوە، دەشـێ هـەمان دابو نـەریت لـەلای کۆمەڵگەیـەکی دیکـە نـەك بـەپیرۆز تەماشا نەکرێن " بەڵکو ڕەت بکرێنەوە. چ قبـوڵکردن و چ ڕەتکردنـەوەی هەر دیـاردەو تێزێك، بـەرەنجامی جۆرە عەقڵیەتێکـەو ئاسـتی گەشـەی عەقڵی هەر کۆمەڵگەیەك بڕیاری قبوڵکردن یان ڕەتکردنەوەی دەدا.

## ئاوڕێك لە بزاڤی عەقڵگەرایی لە مێژووی ئیسلامیدا

ئەگەر بزاڤە فکریی‌و عەقڵییەکان لەخۆرئاوادا، پەیوەندییان بەدەرکەوتن‌و گەشەکردنی شارەکانەوە بووبێ " ئەوا بزاڤی عەقڵی‌و فکری لەمێژووی شارستانیەتی ئیسلامیدا بۆکێشەو ناکۆکی نێوان زانایانی ئیسلامی دەگەڕێتەوە، بەتایبەتی لە سەردەمی ئەمەوی‌و عەباسییەکاندا، کەچەندین تێزو بۆچوونی جیاجیاو قوتابخانەی فکری سەریان هەڵدا(١). وەنەبێ شاریش بەیەکێك لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی بزاڤی ڕۆشنگەری‌و عەقڵی نەژمێررێ لە مێژووی ئیسلامدا " چونکە ئەم کێشە فکرییانە سەرچاوەکەیان مزگەوت‌و شارەکان بوون. بیروڕای جیاوازو بۆچوونی جۆراو جۆر لەهەر کۆمەڵگەو شارستانیەتییەکدا، هۆکارو ڕەگەزێکی کاریگەری گەشەی فکرو عەقڵە. ئەگەر سەرچاوەی عەقڵگەرایی‌و لێکدانەوەی بوون لەخۆرئاوا، عەقڵ بووبێ " ئەوا لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بزاڤی عەقڵگەرایی سەرچاوەکەی ئایین بووە. ڕاستە ئایینیش لە خۆرئاوا پانتاییەکی زۆری لە فکرو عەقڵی خەڵکدا داگیرکردووە، بەلام لە قۆناغی ڕۆشنگەری‌و دوای ڕزگار بوون لە دەسەلاتی کلێساو هەژموونی عەقڵی دوگمای پاپاکان، ئاستی لەبەردەم عەقڵدا زیاتر کرایەوە.

دەتوانرێ دەرکەوتنی موعتەزیلە، کە خاوەنی دیدێکی عەقلانی بوون، بەسەرەتای دەست پێکردنی قۆناغی ڕۆشنگەری لەمێژووی ئیسلامیدا بژمێررێ. ئەمەش بەو مانایە نییە کە پێش ئەو مێژووە بوارێك نەبووبێ بۆ گەشەو چالاکی عەقلگەرایی " بەڵکو هەر لەسەرەتای بلاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، جگەلە سروش (الوحی) خودایی کەبەهۆی پێغەمبەرەوە بەمرۆڤایەتی گەیشت، عەقڵیش لەو بوارانەدا کەپەیوەندییان بەژیانی

ڕۆژانەو جێ بەجێ کردنی ئەرکی ئاوەدان کردنەوەی زەوی‌و بازرگانی‌و لایەنە گۆڕاوەکانی ژیانی مرۆڤـەوە هەیـە، گەشـەی کـردو ڕۆڵـی خـۆی دیاری کرد. بێ بڕواکانی قورەیش‌و نیوە دورگەی عەرەبی، کاتێك لەگەڵ پێغەمبـەردا کەوتنــە ململانــێ‌و دژایـەتیان کـرد، بـۆ ئـەوەی ڕاسـتی پەیامەکـەی بسـەلمێنێ داوای بەڵگـەیان لێ دەکـرد، بـەهۆی ئـەو بەڵگـەو پەرەجو (المعجزة) انەوە کە پیغەمبەر نیشانی دان، ڕووبەڕووی چـەندین پرسیاری جۆراو جۆر بوونەوەو عەقڵ ئەو میکانیزمە بوو کە بـۆ گەیشـتن بـەوەڵامی ئـەو پرسـیارانە بـەکاریان دەهێنـا. لەگـەڵ هـەر پـەیامێکی خوداییدا عەقڵ گەشەی کردووەو لەپاڵ هـەردەقێکی ئایینیـدا مرۆڤـیش دەرگای لەڕوودا ئاوەڵاکراوە بـۆ گەشـەدان بەعـەقڵ‌و هـزری، چ لـەبواری بڕواهێنـان بـەخوداو چ لـەبواری ژیـانی ڕۆژانـەو ئـەم جیهانـەدا. بـەڵام لەسەردەمی ئەمەوی‌و عەباسییەکاندا، موسـڵمانان ڕووبـەڕووی چـەندین کێشـەی سیاسـی‌و فکـری بوونـەوە، کـە ڕێگـەی بۆسـەرهەڵدانی ئـەو قوتابخانــە فکـری‌و عەقڵییانــە خــۆش کــرد، کەپێشـتر لــەو شـێوەیە دەرنەکەوتبوون. جارێکی دیکـە لەئاسۆیەکی دیکـەوە سـەیری قورئـان‌و فەرموودە کـراو خوێندنـەوەو لێکدانـەوەی دیکـەی بـۆکراو چـەمك‌وواتای دیکە لە دایك بوون. ئەگەر قۆناغی ڕۆشنگەری لـەخۆرئاوا پەچـەکرداری ئەو لادان‌و خەیاڵپلاوی‌و زاڵبوونی ئەفسانە بـووبێ بەسـەر عـەقڵی پاپـاو قەشـــەکاندا، بەچـــەمکی کانـــت پزگـــارکردنی مـــرۆڤ بـــووبێ لـــەو دەستەوەستانییەی لەخۆی لێی بەرپرسیارە، ئـەوا ڕۆشـنگەری‌و بزاڤـی عەقلگەرایی لـەکلتورو مێـژووی ئیسـلامیدا لەهـەناوی ئایینـەوە سـەری هەڵداوەو ئـایینیش ڕێگـەی خۆشـکردووە بـۆ زیـاتر گەشـەکردن‌و فـراژوو بـوونی عـەقڵ‌و بزاڤـی عەقلگـەرایی، دەتـوانین دەرکـەوتنی موعتەزیلـە

بەسەرەتایەك لەبزاڤی عەقڵگەرایی لە مێژووی ئیسلامیدا ناوزەد بکەین. شەهرستانی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((یەکێك هاتە لای حەسەنی بەسریو گوتی: ئەی پێشەوای موسڵمانان لەم سەردەمەدا کۆمەڵێك پەیدا بوون، دەڵێن: ئەوەی گوناهی گەورە بکا کافرەو لەڕیزی موسڵمانان دەچێتەدەرێ، ئەوانیش (وەعدیەو خەواریجن). هەندێکی دیکەش بەپێچەوانەی ئەمانەوە، گوناهی گەورە بە کوفرنازانن، کردەوە لەلای ئەمانە بەشێك نییە لەبرواو پێیانوایە سەرپێچی کردنو کردەوەی خراپ پەیوەندی بەبڕواوە نییە، هەروەك چۆن گوێڕایەڵیو سەرپێچی نەکردنی بێ بڕوا، نایکا بە بڕوادار، ئەوانەشی ناویان لە خۆیان ناوە (مورجیئە) پێش ئەوەی حەسەنی بەسریوەڵامی پرسیاری ئەو کەسە بداتەوە، کە پرسیارەکەی کردبوو، (واسڵی کوری عەتا) گوتی: من پێموایە، ئەوەی گوناهی گەورەدەکا بەشێوەیەکی ڕەها بەبێ بڕوا ناژمێرێو لەهەمان کاتیشدا بڕواداری تەولو نییە، بەڵکو لەنێوان ئەم دوولە دایە (منزلة بین المنزلتین)[٤٣]. دوای ئەو قسەیە هەستا لەسوچێکی مزگەوتەکە دانیشتو لەحەسەنی بەسری جیابۆوە، هەرکاتێك یەکێك هاتبایە ژوورەوەو پرسیاری لەحەسەنی بەسری کردبایە، کەبۆچیواسڵ بەتەنیایە، حەسەنی بەسری دەیگوت:واسڵ کەنارگیر بووە. (اعتزل) لێرەوە، کۆمەڵێك کە خاوەنی دیدو بۆچوونێکی عەقڵانی بوون، هاتنە ناو مێژوو، بەموعتەزیلە ناوزەدکران. جگە لەم ڕووداوە، شەهیدکردنی عوسمانی کوڕی عەفان، سەرەتایەك بوو لە مێژووی ئیسلامیدا بۆ قسەکردن لەسەر چۆنێتی هەڵبژاردنی خەلیفەو کێشە سیاسییەکانو جەنگو کوشتاری نێوان موسڵمانان، یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کەڕێگەی خۆشکرد بۆسەرهەڵدانی چەندینو تێزو بیرۆکەی نوێ، ئەو ململانێو

کێشە سیاسییانەوای لەهەندێك لە زاناو عەقڵمەندی ئەو کاتەکرد، کەگومان لەڕەوایەتی ئەو جەنگانە بکەن‌و ئەمەش‌وای کرد جارێکی دیکە چەمکەکانی بڕوا (الأيمان)و گوناهی گەورەو بچووك‌و چەندین‌وتەزای دیکە شوناسی دیکەوەربگرن‌و قسەیان لەسەر بکرێتەوە. هەرکە ئەمەوییەکان دەسەڵاتیان گرتەدەست، هەڵوێست‌و ڕەفتارەکانیان، چەندین پرسیاری لەلای خەڵك بەگشتی‌و زانایانی ئیسلامیی بەتایبەتی‌وروژاند. دروشمی (جەبر)و پەرەپێدانی بیرۆکەی (مورجینە) کە ئەوانەی ئەم دروشمەیان بەرزکردەوە تیوریستی (المنظر)ی ئەمەوییەکان بوون، لەبەرامبەر ئەواندا (قەدەرییەکان) دەرکەوتن، کەخاوەنی دیدو ڕوانینێکی دیکەبوون. مورجینەکان پێیان‌وابوو، مرۆڤی بڕوادار بەکردەوەو ڕەفتاری خراپ‌و گوناهی گەورە لەبازنەی بڕواداران ناچێتەدەرێ‌و هەر بەبڕوادار دەمێنێتەوە. ئەمەش ئەوەی دەگەیاند، کە بڕواداران بەکردەوە لەیەکدی جیان، ئەم دروشمەی مورجینەکان، کە ئومەوییەکان بانگەشەیان بۆدەکرد‌و پشتیوانیان لێ دەکرد، پاساوێك بوو بۆ هەرکردەوەو کارێك کە دەسەڵاتدارانی ئومەوی ئەنجامیان دەداو دەنگی نەیارەکانیان پێ کپ دەکردەوە . کاتێك ئومەویەکان هەر کارێکیان بکردبایەو نەیارەکانیان سەرکوت کردبا، پاساویان ئەوەبوو کە هەرکردەوەو ڕەفتارێك کە مرۆڤ ئەنجامی دەدا،بەویستی خودایەو کردەوەی خراپیش بڕوا هەڵناوەشێنێتەوە. مورجینەکان لەبەرامبەر موعتەزیلەکاندا ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە بوونەوە کەموعتەزیلەکان‌وروژاندیان، ئەویش پرسیارو قسەکردن بوو لەسەر ناووسیفەتەکانی خودا. ئەگەر هەرکردەوەیەکی مرۆڤ کەئەنجامی دەدا، بەویستی خودا بێ، وەك مورجینەکان دەڵێن: ئەی کاتێك مرۆڤ

کردەوەیەکی خراپ دەکا، کەناکرێ ئەمە بدرێتە پاڵ خودا، چونکە خودا پاکـەو دوورە لەهەرسـیفەتێکی خـراپ. موعتەزیلـەکان بۆچەسـپاندنی پـاکی‌و بـەدوورگرتنی خـودا لـەوەی کەسـیفەتی خراپـی بدرێتـە پـاڵ، دروشمی‌ویسـتی ئازادانـەی مرۆڤیـان بـەرزکردەوە، واتـە مـرۆڤ ئـازادەو لێپرسراوە بەرامبەر بەهەر کردەوەیەك کە ئەنجامی دەدا، ئەم کردەوەیە کردەوەی چاك یـان خـراپ بێ. تەنانـەت یـەکێکی‌وەك (جـەهمی کـوڕی سـەفوان) بـۆ جەختکردنـەوە لەسـەر خـودا بـە تـاکزانین (التوحیـد) لەبیرۆکەی (جەبر) نزیـك بۆوە " چونکە بـەلای جەهمـەوە سیفەتەکانی خـوداو مـرۆڤ لەیەکـدی جیـان‌و بۆیـەوەی تێکـەڵ نـەکرێن، نـابێ ئـەو سـیفەتانەی دەدرێنـە پـاڵ مـرۆڤ بدرێنـە پـاڵ خـودا. ئەمـەش بۆدوورکەوتنـەوە لەچـەمکی‌وەك یـەك (التشـابە) ی سیفەتەکانی خـوداو مرۆڤ. جەهم لەو بارەوە دەڵێ: ((لەڕاستیدا هیچ بکـەرێك جگـە لـەخودا نییەو هەرئەو خاوەنی‌ویست‌و دەسەڵاتەو بکـەری هـەموو کردەوەیەکـە " بـەڵام کاتێـك مـرۆڤ کردەوەیـەك ئـەنجام دەدا، بەشـێوەیەکی خـوازە (المجـاز) دەدرێتـە پـاڵ مـرۆڤ. خـوداوەك چـۆن درەخـت‌و مـانگ‌و ڕۆژی دروست کردووەو هۆی جوڵانیان دەگەڕێتەوە بۆخودا، بەهەمان شێوەش هێزێکی لە مرۆڤـدا دروسـت کردووە، کەدەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـردەوە ئەنجام بدا، هەروەك چۆن درێژی‌و ڕەنگی جیاجیای بـەمرۆڤ بەخشیوە، بـەبێ ئەوەی‌ویسـتی مرۆڤـی لەسـەربێ. . . ))[*] هەریـەك لـە مرجیئـەو موعتەزیلە خاوەنی دوو دیدی جیابوون لەبارەی‌ویستی مرۆڤەوە، ئەگـەر مورجیئەکان‌ویستیان لەمرۆڤ سەندەوە " ئەوا موعتەزیلـەکان، ویسـتیان گێڕایەوە بۆمرۆڤو بەلایانەوە مرۆڤ ئازادە لـەوەی چ کردەوەیـەك ئـەنجام دەدا. ئەگەر لەسەردەمی پێغەمبەردا (ص) کۆمەڵگـە دابـەش بـووبێ بـۆ

دووبەشی بێ بڕواو بڕوادار، ئەوا لەدوایداو بەتایبەتی لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا، کە جوگرافیای ئیسلامی فراوانتربوو، چەندین تیرەو هۆزو نەتەوە، بەزمانو ڕەنگی جیاجیاوە هاتنە ناو ئیسلامو لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا، کاتێک ململانێ گەیشتە رادەیەک کە موسڵمان بچێتەسەنگەری دژبەرای موسڵمانی، کەزۆربەی ئەمانەش هاوەڵانی پێغەمبەربوون. هەموو ئەمانە دەرگایان بەڕووی دەرکەوتنی چەندین دیدو بۆچوونی جیاجیاکردەوەو چەمکووتەزا ئیسلامییەکان بە دیدێکی دیکەو خوێندنەوەیەکی دیکەوە هەڵسەنگێنران. لەوکاتەوە ئیدی ئەو دەرگاو دەلاقانە کرانەوە، کە لەسەر قسەکردنو لێکدانەوەی دەقەکانی ئیسلام داخرابوون. نابێ ئەمەشوالێکبدرێتەوە، کەپێشتر هیچ لێکدانەوەیەک بۆدەقەکان نەکراوە " بەڵام تائەو کاتە کۆمەڵگەی ئیسلامی قوتابخانەی سەربەخۆی لەم چەشنەی بەخۆیەوە نەدیبوو، کەرافەی دەقەکان بکاو تیزو بیرو لێکدانەوەی جیاجیای لێ بێتە بەرهەم. ئەگەر ڕۆشنگەری لە خۆرئاوا بەشێکی پرۆژەکەی ئەوەبووبێ، کە قسە لەسەر دەقەکانی ئاین بکرێ، بەبێ ئەوەی ئەم قسەکردنە تایبەت بکرێ بەچەند کەسێکەوەو لەلایەن ئەو چەند کەسەوە قۆرخ بکرێ " ئەوا لەمێژووی ئیسلامدا بەهەمان شێوە بە قسەکردن لەسەر دەقەکانی ئاین دەستی پێکرد. دەرکەوتنی هەریەک لەموعتەزیلەو ئەشعەریو مورجینەو ئەوانی دیکە، ئاسۆی بزاڤی عەقڵگەراییان بەرینترکردو گەشەیان بەچالاکییە فکریو عەقڵییەکانداو هەرزاناو بریارە لەیەکێک لەو قوتابخانە فکرییانەدا چالاکی نواند. هەڵگەڕانەوەیواسڵی کوڕی عەتا لەحەسەنی بەسری مامۆستای ڕێگەی لەوانە گرت، گەر بیانویستایە دەقەکانی قورئانو فەرموودە بۆخۆیان قۆرخ بکەن، وەک ئەوەی لەسەدەکانی

ناوەڕاستدا، قەشەو پاپاکان لەئەورووپا کردیان. کاتێك ئیسلام لەنێوە دورگەی عەرەبیدا بڵاوبۆوە، شوێنگەو پانتاییەکی بۆ ئەو بیروباوەڕو بۆچوونانە نەهێشتەوە، کەلەگەڵ پەیامە یەکخولناسییەکەیدا ناکۆك بوون " بەلام لەدواییداو بەتایبەتی لەو قۆناغەدا کە بە شێوەیەکی خێرابلاو بۆوە، پاشماوەی ئەو بیروباوەڕانە گەڕانەوە کە ماوەیەك بوو لەبیرچووبوونەوە. کاریگەری ئەمانەش بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەڕوخساری کۆمەڵگەوە دەرکەوت، بەتایبەتی لەکاتی سەرهەڵدانی بزاڤە فکریو عەقڵییەکاندا. لێرەوە ڕێگە بۆکەسانیوەك (عەبدولای کوری سەبەء) خۆش بوو، بۆئەوەی بەرەو بەبیروباوەڕی جولەکایەتیو مەسیحایەتی بدا"[٣٠]. کاتێك مرۆڤ بڕوا بەهەر بیرو باوەڕێك دێنێ، بەپێی جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیریو هۆشیاری ئەو کەسو گەلو نەتەوەیە، ئەو بیروباوەڕە شێوازی جۆراوجۆر بە خۆیەوە دەگرێو لەڕەنگو ڕوخساری جیاجیادا بەرجەستە دەبێ. حاڵەتە جیاجیا کان دەست نیشانی چۆنێتی ئەو بیروباوەڕە دەکەن، کەلە بیرو هزری ئەو کەسەدا هەیە. ئەم ئاستە فکریو عەقڵییەی کەبە ڕووی موسڵماناندا کرایەوە، لە چەمکێکو سنوورێکدا نەمایەوە، بۆ قسەکردن لەسەر بابەتەکانی بوونو ژیان. جیاکردنەوەی بڕوا لە کردەوەو دابەش بوونی کۆمەڵگەی ئیسلامی بۆ دوویەشو دوو دیدگای جیا دەربارەی دەربارەی دوالیزمی بڕوا / کردەوە، جەبر/ اختیارو چەندانی دیکە، ئاسۆیەك بوو بۆ قسەکردن لەسەر بابەتەکانی دیکە، ئەمەش فکرو عەقڵی موسڵمانانی گەشەپێدا. زانایانو بیریارانی ئیسلامی هەریەکەیان لەدیدگایەکەوە، قسەیان لەسەر زانینو بڕواکرد. هەموویان لەوەدا کۆك بوون کە زانینو بڕوا بەیەکەوە گرێبدەن. یەکێکیوەك جەهم دەڵێ: ((کوفر ئەنجامی نەناسینی

خودایە))[٦٠]. بەڕای هەندێك لەو زانایانە مرۆڤ بەئەندازەی پێویستی خۆی دەزانێ. واتە زانین و ئەومەعریفەیەی مرۆڤ لەژیانیداوەدەستی دێنێ، بەرەنجامی پێداویستییەکانی ژیانیەتی. یەکێکی وەك جاحز(الجاحظ) لەوبارەوە نموونە بەمندالْ دێنێتەوە، مندالْ بەئەندازەی پێویستی تەمەنی خۆی لەدەوروبەر دەگاو دوای ژیانی بەکۆمەلْو پێداویستییە جۆربەجۆرەکانی ژیانی مرۆڤ دەبنە هاندەرێك بۆ زیاتر زانین ووەدەست هێنانی مەعریفە ئەگەر تەمەنی مندالی مرۆڤ پێویستییەکانی سنووردار بکا، ئەوا لەدوایداو لەژیانی بەکۆمەڵدا لەگەلْ زیاتر بوونی پێویستییەکان سنوورەکانی زانینیش فراوان دەبن. حەزی مرۆڤ بۆزانین و فێربوون، بەشێکە لەسروشتی مرۆڤو جۆرێکی دیکەش زانین و مەعریفە هەیە، کەمرۆڤ بەهۆی هەوڵو تێکۆشانی خۆیوەدەستی دێنێ، نەك وەك حاڵەتێکی سروشتی و زگماکی. ئەو زانین و زانیارییەی کە سروشتی و زگماکییە، هەموو مرۆڤەکان بەبێ جیاوازی تێیدابەژدارن، بەلام ئەو زانین و مەعریفەیەی بەرهەمی هەوڵو تێکۆشانی مرۆڤە، لەیەکێکەوە بۆیەکێك بەئەندازەی هەوڵوتێکۆشانی کەسەکان دەگۆڕێ. جاحزو شەهرستانی و قازی عەبدولجەبارو موعتەزیلەکانی دیکە، بۆچەسپاندنی بیرۆکەی ویستی ئازادی مرۆڤ، جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە زانین و مەعریفە لەلایەن خوداوە بەمرۆڤ بەخشراوە " بەلام مرۆڤ ئازادە لەوەی چۆن ئەم زانینە بەکاردێنێ. پاداشت و سزا بەندە بەئازادییەوە، کاتێك مرۆڤ پاداشت یان سزاوەردەگرێ، کەئازادبێ لەوەدا، کەچاکە دەکا یان خراپە. هەرکاتێك ئەم ئازادییە لە مرۆڤ سەنرایەوە، چ چاکەکردن و چ خراپە، چەمکی ڕاستەقینەی خۆیان لەدەست دەدەن. وەنەبێ موعتەزیلە یەکەم گروپو کۆمەلْ بووبێ، هەولی بەیەکەوە

گرێدانی عەقڵو ئایینیان دابێ " بەڵکو دواتریشو بەدرێژایی مێژووی ئیسلام لەگەڵ هەر بزاڤو جوڵەیەکی ئەم ئایینەدا، فکرو تێزی جۆراوجۆر دەرکەوتوون. جگە لەم حاڵەتانە دانەبێ کە کەسانێکی خاوەن عەقڵیەتی دوگمایی‌و چەقبەستوو، رێگربوون لەوەی ئەم ئایینە خۆی نوێ بکاتەوەو لەگەڵ رەوتی هەنگاوەکانی مێژوو هەنگاوبنێ‌ووەلامگۆی خواستە ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و سیاسیەکانی ژیانی کۆمەڵگە بێ. هەر کاتێك موسڵمانان هەوڵیاندابێ ئەم پەیامە بەدەوروبەری خۆیان بگەیەنن، رووبەڕووی چەندین پرسیارو مشتومڕو لێدوانی نێوان خۆیانو بەرامبەریان بوونەتەوە. کە موعتەزیلە هێندە جەختیان لەسەر عەقڵ دەکردەوە، وەك دکتۆر (نەسر حامد ئەبوزەید) باسی دەکا، لەو سەردەمەدا چەندین رێبازی فەلسەفی‌و فکری‌و بیروباوەڕی جۆراو جۆر هەبوون، کەپێویستیان بە رووبەڕووبوونەوەیەکی عەقلانی هەبوو، موعتەزیلە ئەو ئەرکەیان گرتە ئەستۆ[٣٢]. عەقڵ ئەو چەکە بوو، کەلەبەرامبەر روانین‌و فەلسەفەو عەقلانییەکی ئەوی دیکەدا بەکارهێنرا. ناکرێ چاو لەوڕاستییەش بپۆشین، کەلەمێژووی ئیسلامیدا، بەهۆی بەدحاڵیبوون‌و هەژاری مەعریفی‌و دوور لەهەر تێگەیشتن‌و روانینێکی عەقلانی دژایەتی رەوتو بزوتنەوە عەقلانییەکان کراوە. دوور لە تێگەیشتنێکی راستەقینە لە ئیسلام، بەدرێژایی مێژووی ئیسلامی چەندان دەست لە پشت برەودان یان رەتکردنەوەی ئەو تێزو بۆچوونانە بوون کەسەریان هەڵداوە. ئەوە ئایینی ئیسلام نییە کەهەندێك لەو تێزو بۆچوون‌و قوتابخانە فکری‌و عەقڵییانە رەت دەکاتەوە یان قبوڵیاندەکا " بەڵکو کۆمەڵگە لەپشت ئەو رەتکردنەوەو قبولکردنەوەوەیە، هەندێ جاریش ناهۆشیاری خەڵكو هەندێ جاری دیکەش دەسەلات بۆ

مەبەستو مەرامی خۆی ڕۆڵی هەیە لەبرەودان. بەهەندێك تێزو ڕەتکردنەوەی هەندێکی دیکەدا. بەدرێژایی مێژوو عەقڵو ئایین لەتەنیشت یەکەوە بوون. ئەو پەیامەی پێغەمبەران هێناویانە بووەتە مایەی سەرنج و پرسیاری خەڵك، مشتومڕو لێدوانی نێوان هەڵگرانی پەیامی خودایی‌و ئەوانەی نکۆڵییان لەو پەیامانەکردووە، گەشەی بە بزاڤی عەقلگەرایی داوە، چ ئەوانەی بڕوایان پێکردوون‌و چ ئەوانەی پەیامەکەیان ڕەتکردۆتەوە، بڕواهێنان‌و ڕەتکردنەوەکە، لەڕوانگەی لۆژیك‌و عەقڵەوەبووە. دەرکردنی عەقڵ لەبازنەی ئایین، بەو پاساوەی کە ئایین سەرجەم بوارەکانی ژیان دەگرێتەوەووەڵامگۆی سەرجەم پرسیارەکانە، بانگەشەی کەسانێك بووە، کەویستوویانە لێکدانەوەی دەقەکانی ئایین بۆ خۆیان قۆرخ بکەن، زۆرجاری دیکەش ململانێیەکانی دەسەڵات، عەقڵیان خستۆتە پەراوێزەوە. موعتەزیلەوەك چەندین تێزو فکریی دیکەی ناو جیهانی ئیسلامی، جۆرە خوێندنەوەیەك بوو بۆ دەق و هەڵەیە ئەم تێزو بیرو بۆچوونانە لەبازنەکانی هەڵەو ڕاستو گومراو ناگومرادا پۆلین بکرێ. ئەم بۆچوونەی موعتەزیلە، ئەوە ناگەیەنێ، کە لە چوارچێوەی ئایین دەرچووبێ، ئاساییە کە نەیانتوانیبێ لە زۆربەی ڕاو بۆچوونەکانیاندا ڕاستی بپێکن، چونکە ئەمە سروشتی هەموو فکرو ڕوانینێکی مرۆییە. دەقەکان بۆ ئەوە هاتوون، کەقسە لەگەڵ عەقڵی مرۆڤدا بکەن‌و عەقڵی مرۆڤیش لە یەك ئاستدا نییەو عەقڵی یەکێك لەیەکێکی دیکەو لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە دەگۆڕێ. لێکدانەوەی دەقی ئایینی‌و ڕاڤەکردنی جیایە لە نکۆڵی لێ کردن‌و بەرپەرچدانەوەی، ئەوانەی بڕوایان بەدەقەکانی ئایین نەهێناوە،

زۆربەیان دوای چەندین بەڵگەو پەرەجوو نکوڵییان لێ کردووە، کەئەمەڕاڤەکردن و بۆچوون نییە " بەڵکو سەرکەشی و لادانە لەو پەیامانەی کەبەبەڵگەو پەرەجوو ڕاستییەکانیان سەلمێنراوە. کاتێک سروشتی ئایینی ئیسلام وابخوازێ جێگەی ڕاو بۆچوونەکانی شافیعی و مالیکی و ئەوانی دیکە بکاتەوە، هەر هەمان سروشت وادەکا، جێگەی موعتەزیلەو چەندانی دیکەش بکاتەوە. (لالاند) دوو جۆر عەقڵ لەیەکدی جیادەکاتەوە، یەکێکیان عەقڵی پێکهێنەر یان کارا، کەبریتییە لەکۆی ئەو ڕوانین و بۆچوونانەی مرۆڤ بەرامبەر بەدەوروبەر هەیەتی، کەهەموو کەس لەم عەقڵەداوەک یەک بەشدارە، ئەمەش لەدوایدا لەشێوەی کۆمەڵێک بنەماو یاساو چەمکدا بەرجەستە دەبێ. ئەوەی دیکە عەقڵی پێکهێنراو یان باوە، ئەمیش ئەو عەقڵەیە کەلە کۆمەڵێک بنەماو ڕێسای قبوڵکراو پێک دێ، کە لە سەردەم و کاتێکی دیاریکراودا برەوی هەبووەو لەدواییداوەک کۆمەڵێک ڕاستی ڕەها خۆی نواندووە"[**]. (محەمەدعابد ئەلجابری) لەو ڕوانگەیەوە پێکهاتەی عەقڵی عەرەبی شی دەکاتەوەو پێی وایە کاتێک عەقڵی عەرەبی کۆمەڵێک یاساو ڕێساو چەمك دادەڕێژێ و لەسەردەم و کاتێکی مێژوویی دیاریکراودا عەقڵی عەرەبی پێ دەناسرێتەوە، بەبێ ڕەخنەلێ گرتن و تێپەڕاندنی ئەم عەقڵە ناتوانرێ عەقڵی عەرەبی لە قۆناغێکەوە بچێتە قۆناغێکی دیکە " بۆیە پێویستە پرۆسەی ڕەخنەگرتن لەعەقڵی باو دەستپێک بێ بۆ گۆڕانکاری لە عەقڵی عەرەبیدا. لەفکری یۆنانی و ئەورووپیدا عەقڵ لەو پەیوەندییەدا، کەلەگەڵ سروشتدا هەیبووە، گوزارشتی لەخۆی کردووە. بۆ دۆزینەوەی شوێنگەی عەقڵ لە مێژووی ئەم دوو شارستانیەتیەدا، دەبێ لەو پەیوەندییەوە بڕوانرێ کە لە نێوان عەقڵ و سروشتدا هەیە. سروشت

بابەتێکە بۆ لێدوان و بیرکردنەوەو ڕامانی عەقڵییەتی یۆنانی و ئەورووپی. کاتێك عەقڵیەتی یۆنانی لەجەوهەرو ناوەڕۆك و پێکهاتەی شتەکان دەکۆڵێتەوەو ڕەهەندێکی مەعریفییان دەداتێ. لەبەرامبەردا عەقڵییەتی عەرەبی ڕەهەندێکی بەهایی (القیمی) بەشتەکان دەبەخشێ. ئەوەندەی لەعەقڵییەتی عەرەبیدا لایەنی ئاکاریی و بەهایی گرنگەو ڕوانینی بۆشتەکان لەدیدگای (چاك، خراپ، جوان، ناشیرین)ەوەیە، ئەوەندە شیکارکردن و لێکۆڵینەوە نییە لەپێکهاتەی خودی شتەکان و ئەو بابەتەی کە پێویستە لێ ی بکۆڵرێتەوەو هەڵوێستەی لەبەرامبەردا بکرێ"". لێرەدا دەردەکەوێ کەلەلای یۆنانی و ئەورووپییەکان، ڕۆڵ و ئەرکی عەقڵ تەنها ئەوەندە نییە کە، چاکی و خراپی و بەکەڵکی و بێ کەڵکی شتەکان دەربخاو هیچی دیکە، بەڵکو عەقڵ دەبێ لەدیوی دەرەوەی شتەکان و دیاردەکان نەوەستێ و ئەو سنوورە تێپەڕێنێ و لە چیەتی و ناوەڕۆکی شتەکان وردبێتەوەو ڕەهەندێکی مەعریفییان پێ ببەخشێ. بۆدۆزینەوەی نهێنی و چییەتی هەردیاردەو شتێك، ڕامان و ووردبوونەوەو لێکدانەوەی جۆراوجۆرو دیاریکردنی پێکهاتەوە ڕەهەندە جیاوازەکانی پێویستن. ئەو پرسیارەی کەلێرەدا دەشێ بکرێ، ئەوەیە کە ئایا دەشێ ئەم تێزەی جابری گشتگیربکرێ و لە هەموو قۆناغ و سەردەمێکدا عەقڵیەتی یۆنانی و ئەورووپی و عەقڵیەتی عەرەبی، هەمان دەرەنجامی هەبێ؟ جابری پێی وایە کەتایبەتمەندییەك لەعەقڵیەتی یۆنانی و ئەورووپی و عەرەبیدا، بووەتە هۆی ئەم جیاوازییە. عەقڵیش وەك بەشێکی گرنگ لەپێکهاتەی مرۆڤ، لەگەشەو نەشو نماکردن و گۆڕاندایەو چەندین هۆکار دەبنە یارمەتیدەر بۆگەشەی عەقڵ و لەهەمان کاتدا چەندین هۆکاریش دەبنە هۆی ئەوەی کەگەشەو بزاوتی عەقڵ بوەستێنن و

لەدوگمایبیدا ببهێڵنەوە. هەریەك لە (هردەر)و (ئەدوارسابیر) پێیان وایە، کە زمان پەیوەندی بەعەقڵ و ڕوانینی مرۆڤەوە هەیە، زمان چۆنێتی بیرکردنەوەو عەقڵی مرۆڤ دیاری دەکا[1]. لەو ڕوانگەیەوە، گەر بمانەوێ لە عەقڵی گەلو نەتەوەیەك بگەین و ئاستی گەشەی ئەو عەقڵە دیاری بکەین، پێویستە لەزمانی ئەو گەلە بگەین. زمانی عەرەبی یەکێکە لەو زمانانەی کە لەناو گەلانی موسڵماندا وێڕای زمانی زگماکی ئەو گەلە موسڵمانانە، کاری لەعەقڵ و بیرکردنەوەی ئەو گەلانە کردووە. ئەگەر ئەو گەلە موسڵمانانە، لەلایەك بەزمانی زگماکی خۆیان دوابن، ئەوا لەلایەکی دیکەوە زمانی عەرەبی سنووری عەقڵ و بیرکردنەوەی دەست نیشان کردوون. هەروەك چۆن زمانی ئاخاوتن و قسەکردن لەزمانی شیعرو ئەدەب جیایە، بەهەمان شێوە زمانی فیکرو عەقڵ لەزمانی ئاخاوتن جیایە. بۆئەوەی عەقڵ لەگەشەیەکی بەردەوامدابێ، دەبێ زمانی عەقڵ بگۆڕێ، هەرئەم دوگمایی و لەچوارچێوەی چەند ڕێسایەکی زمانەوانیدا بەندکردنی زمانە، بووتە هۆی گەشەنەکردن و نەشونمانەکردنی عەقڵی عەرەبی، بەعەقڵی ئیسلامشەوە. ئەو گەلانەی کەخاوەنی زمانی زگماکی خۆیان بوون و ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان قبوڵکردووە، لەگەڵ پاراستنی زمانەکەیان، کاریگەری زمانی عەرەبیشیان لەسەربووە " چونکە زۆر لەشاعیران و نووسەرانی ئەوگەلانە وێڕای ئەوەی کەبەزمانی زگماکی خۆیان شیعرو بەرهەمیان پێشکەش کردووە، بەزمانی عەرەبیش نووسیویانە. شاعیرێکی وەك نالی لەپاڵ زمانی عەرەبیدا، شانازی بەزمانی کوردیەوە دەکاو لەودێڕە شیعرەدا، کەزۆریەی خوێنەری کورد لەبەریەتی،وەلامی ئەوکەسانە دەداتەوەو بەنادان ناوزەدیان دەکا کەپێیان وایەشیعرنووسین بەزمانی کوردی زۆرلەخۆکردنە.

کاتێك شێوازو جۆری زمان، شێوازو پێکهاتەی عەقڵ دیاری دەکا " کەواتە بۆخوێندنەوەو ناسینی عەقڵیەتی عەرەبی، دەبێ زمانی عەرەبی بخوێندرێتەوەو بزانرێ. هەر لەو ڕوانگەیەوە جابری پێی وایە، کە ئەوهەوڵ‌و کۆششەی زانایانی ئیسلامی بۆ خزمەتکردن‌و داڕشتنی زمانی عەرەبی ئەنجامیاندا، وێڕای خزمەتکردن بەو زمانە نابێ ئەوڕاستییەش فەرامۆش بکرێ کەئەو ڕێساو یاسایانەی کەئەو زانا موسڵمانانە بەسەر زمانی عەرەبیدا سەپاندیان، لەگەڵ گرنگی‌و بایەخی ئەم هەوڵەیاندا، زمانی عەرەبیان چوارچێوە بەندکرد، بەشێوەیەك گەشەو گۆڕانیان لەو زمانەدا کوشت، کەزمان‌و عەقڵیش پەیوەندیان بەیەکەوە هەبێ، کەواتە کوشتنی گەشەو گۆڕانکاریی لەو زمانەدا دەبێتە هۆی کوشتنی گەشەو گۆڕانکاریی عەقڵیش. ئەگەر گرنگیدان بەلایەنی زمانەوانی‌و قوڵبوونەوە لەو بوارەدا، بەشێك بێ لەبزاڤی عەقلگەرایی، ئەمە ئەو عەقڵە گشتگیر ناکا " چونکە بۆگەیشتن بەبزاڤێکی عەقلگەرایی گشتگیرووەرچەرخانێك لەو بوارەدا گەشە پێدانی بەشێك‌و لایەنێك بەس نییە. ئەگەر لەلایەك زانستی زمانەوانی جووڵەیەکی بەعەقڵی عەرەبی _ ئیسلامیی دابێ، ئەوا لەلایەکی دیکە بەهۆی زۆر جەخت کردنە سەر ئەم لایەنەو گۆشەگیرکردنی ئەم لایەنەش لەچەند ڕێسایەکی نەگۆڕدا، لایەنەکانی دیکە کە بۆ گەشەو عەقڵ پێویستن لەکلتوری عەرەبی‌و ئیسلامیدا پشت گوێ خراون. ئەگەر لە قۆناغ‌و سەردەمێکی دیاریکراوی مێژووی ئیسلامدا چەند فەیلەسوف‌و بیریارێك دەردەکەون‌و چەند ڕێبازێکی فکری‌و بۆچوونی فەلسەفی دەردەکەون، ئەوا مێژوویەکی درێژیش هەیە، کەبەدەگمەن ناوی فەیلەسوفێك یان بزاڤێکی فیکری‌و عەقڵی دێت. زاناموسڵمانەکان بۆداڕشتنی یاساکانی زمان، پەنایان دەبردە بەر

عەرەبە دەشتەکییەکان، لەکاتێکدا کە شارەکان لەڕووی‌وشەو زاراوەی شارستانێتی دا دەوڵەمەندبوون و لەهەمان کاتدا قورئانی پیرۆزیش پڕییەتی لەوشەو زاراوەی شارستانێتی، کەچی ئەوان پشت بەگۆکردن(التلفظ)ی دەشتەکییەکان دەبەستن، بەم شێوەیە زمانی زارەکی بووەتە سەرچاوەیەك، کە بونیادی عەقڵی عەرەبی پێك هێناوە. دیارە زمانی زگماکی‌و نووسین، هەر یەکێکیان کاریگەری تایبەتییان لەسەر پێکهاتەی عەقڵی مرۆڤ هەیە. لەئەنجامدا زمانی پاراو (الفصحی)ی عەرەبی کەلە عەرەبە دەشتەکییەکان‌وەرگیراوە، دەبێتە بەشێك لەخەیاڵدان‌و هەست‌و نەستی عەرەبی‌و ئەمەش کەسی عەرەبی لەهەر پێشکەوتنێکی ژیاری‌و شارستانێتی دوور دەخاتەوەو ئەم جیهانەوشك‌و دوورلەگەشەو نامێژوویی‌و هەستی (الحسی) ییەی کە تاکی عەرەبی تێیدادەژی دەیگێڕێتەوە بۆ چاخەکانی پێش مێژوو، چاخی نەفامێتی (العصر الجاهلی)، چاخی پێش پێکهاتەی دەوڵەت[11].

ئەگەر قۆناغی پێش نووسین لەگەڵ قۆناغی دوای نووسین، دوو قۆناغ بن، یەکەمیان بەقۆناغێکی ناژیاری بژمێرریەو دووەمیان بە قۆناغێك کە مرۆڤ ژیاری بنیاتناوە، ئەوا زمانیش کاتێك کە لەنووسیندا گوزارشتی لێکراوە، گەشەیەکی دیکەی بەعەقڵ داوە، عەقڵێك لەقۆناغی پێش نووسیندا جیایە لەعەقڵی دوای نووسین، لەگەڵ نووسیندا زمانیش گەشەی کردووە.

عەلی کەریم دەڵێ: ((زمان ئەو فکرەیە کە ژیاردەبزوێنێ زیاتر لەوەی کە میکانیزمێك بێت بۆ گوزارشت لێ کردن))[12] چالاکی‌و گەشەی ژیان لە چالاکی‌و گەشەی عەقڵیی جیاناکرێتەوە. چالاکی‌و تواناو ئاستی گەشەی عەقڵیی مرۆڤ لەزماندا گوزارشتی لێ دەکریێ. ئەگەر بڕوا بەو بیرۆکەیە

بکەین کە، پێی وایە زمانەکان لەبنەڕەتدا یەك یاسای ڕێزمانییان هەیەو هیچ زمانێك لەو ڕووەوە لەزمانێکی دیکە پێشکەوتووتر نییە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە زمانێك لەزمانێکی دیکە لەڕووی گەشەی فەرهەنگووشەو زاراوەوە جیاوازییان نییە. قۆناغەکانی گەشەی زمانی هەر گەلو نەتەوەیەك گوزارشتە لەئاستی گەشەی عەقڵیو فکری ئەو گەلو نەتەوەیە لەوقۆناغە دیاریکراوەدا. باسی جیاوازی ئەدەبی فۆلکلۆریو ئەدەبی نووسراوی هەر گەلو نەتەوەیەك تەنها جیاوازی شێوازی دەربڕینو بەکارهێنانی زمانی لێك جودای ئەو دوو ئەدەبەنییە " بەڵکو ئەم جیاوازییە عەقڵیش دەگرێتەوە، دەرەنجامی ئەم دوو شێوازە جودایەی زمان، دوو جۆر عەقڵی لێك جودایە. ئەگەر ئەو بیرو رایەی جابری کەلەبارەی زمانی عەرەبییەوە دەیخاتە ڕوو لەگەڵ زمانی کوردیدا بەراورد بکەین " دەبینین زمانی کوردیش ڕووبەڕووی هەمان حاڵەت بۆتەوە. ڕۆشنبیرو نووسەرو زانایانی زمانی کوردی، کاتێك بەچاوی ڕێزو شانازییەوە، سەیری فۆلکلۆری کوردیو شێوە ئاخاوتنی ناوچە شاخاویو گوندە دوورە شارەکانی کوردەوارییان کردووە، بەم کارەیان چەند ئەرکی نیشتمانیو نەتەوایەتییان جێ بەجێ کردووە، ئەوەندەش دەرگایان لەڕووی گەشەو بەرەو پێشەوەچوونی زمانی کوردیدا داخستووە. سنووردانان بۆ جوڵەو گەشەی زمان، لەهەمان کاتدا سنووردانانە بۆ گەشەو جوڵەی عەقڵیش. دوالیزمی زمان / عەقڵ بەیەکەوە هەناسەدەدەن " بەڵام نابێ ئەو ڕاستییە لەبەر چاو نەگرین، کە ئەم حاڵەتەی گەلی کورد لەحاڵەتی گەلی عەرەب جیایە، میللەتی کورد لەبەردەم هەڕەشەی لەناوچوونو پاکتاوی ڕەگەزیدا بووە" بۆیە ناچار بووە بۆپاراستنی ئەو ڕەسەنایەتیو کەسایەتییە

هـــــەرەشەلێکراوەی خـــــۆی، پـــــارێزگاری لـــــە فۆلکلـــۆرو داب و نـــەریت ووشەو فەرهەنگی خۆی بکا، ئەم پاڵنەرەوای لەگەڵی کوردو تاکی کوردی کردووە، بەردەوام ناسنامەی نەتـــەوایەتی خـــۆی لەپاراستنی ئـــەم ڕەســـەنایەتییەدا ببینـــێ، کـــە سەرچـــاوەکەی شـــێوە ئاخـــاوتن و قسەکردنی ناوچەشاخاوی و گوندە دوورە شارەکانی کوردستان بووە.
ئەگەر گەلی کورد، وەك گەلی عەرەب لەپشت بەستن بە شێوە ئاخـاوتن و قســـەکردنی ناوچـــە دوورە پـــەرێزەکان، لـــەوەدا ڕووبـــەڕووی گرفـــت بوو بێتـــەوە، کـــە زمـــانی دووچـــاری چەقبەســـتن و بەوەڤۆیـــەوە عەقڵیشـــی دووچاری دوگمایی کردبێ، ئەوا گەلی کـورد لـەوەدا مەبەسـتێکی دیکـەی هێناوەتەدی، ئەویش پاراستنی زمانەکەیەتی لەووشەو زارەوەی بێگانە، کاتێـك کـورد مامەڵـەی لەگـەڵ زمانـدا،لەو ڕوانگەیـەوە نـەکردووە، کـە پەیوەندی نێوان زمـانو عـەقڵ ئاشـکرا بکـا، پاسـاوی ئـەوە بـووە کـە زمـانو بـوونی نەتەولیـەتی لەبـەردەم هەڕەشـەی جینۆسـایدو پاکتـاوی ڕەگەزیدا بووە.

# پەیامی ئایینی و عەقلانییەت

پەیامی ئایینی کە خودا بەهۆی نێرراوەکانییەوە بۆ مرۆڤی ناردووە، مرۆڤی ڕووبەڕووی چەندین پرسیارو سەرسوڕمان کردووە. وەنەبێ تەنیا ئەوانەی بڕوایان بەو پەیامە نەهێناوە، ڕووبەڕووی پرسیار بوونەوەو لەبەرامبەر ئەم پەیامەدا هەڵوێستەیان کردبێ " بەڵکو ئەوانەی بڕواشیان پێ هێناوە، لە کێشەو گرفتی پرسیار ڕزگاریان نەبووە. ئەمەش ئەو ڕاستییەمان پێ دەڵێ کەپەیامی خودایی بەئاسانی خۆی بەدەستەوە ناداو ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم پەیامە پەیامێکی پڕ پێچو پەناو ئاڵۆزە بەڵکو پەیامێکە لەنادیاردا بەرجەستە دەبێو بەشێکی ئەم پەیامە باسی نادیارە، نادیاریش بەردەوام مرۆڤ دووچاری سەرسوڕمانو پرسیارو ڕاچڵەکان دەکا. محەمەد شبستەری دەڵێ: ((کاتێك جیهان، جیهانە کە نهێنییەکان ئاشکرا نەبن، ئەگەر بشێ نهێنییەکان ئاشکرا بن، ئەوا جیهان لەناو دەچێو مرۆڤ لە مرۆڤایەتی خۆی دەکەوێ ))[1] ئەوەی بەردەوامی بەهەر پەیامێك دەبەخشێ، ئەم حاڵەتی سەرسوڕمانو دووچاری ڕاڕایی کردنەیە کە مرۆڤ بەهۆیەوە، ئاسۆی زیاتری لەبەردەمدا دەکرێتەوەو لەناخو دەروونەوە هەست بەجۆرێك لەگەشەو نەشونما دەکا. زیندوێتی مرۆڤیش بەبەردەوامی پرسیار کردنەوەوەیە، مەرگی مرۆڤ ماوکاتە لەگەڵ مەرگی پرسیارو سەرسوڕمان. مەبەست لەسەرسوڕمانو ڕاڕایی ئەوە نییە، مرۆڤ سنوورەکانی ڕاستیو هەڵەو جوانیو ناشیرینیو چاکەو خراپەی بۆ لەیەکدی جودا نەکرێتەوەو ڕوانینەکانی بەئاسۆیەکی تاریك بسپێرێ، کەسی بڕوادار بەهۆی بڕواهێنانەوە، هەست بەئارامیو دڵنیایی دەکا " بەڵام ئەمەوای لێ ناکا، کەنیدیواز لەپرسیار

بێنیٔ وئه زموونه کانی ڕاچڵه کین بۆ چهندەمین جار دووبارەنه کاتهوه.
پرۆسهی بڕوامهێنان لهگهڵ گۆرانی حاڵهته سایکۆلۆژیی و گۆرانی ههلومهرج و حاڵهتی جیاجیای ژیانی مرۆڤ، ئهویش دهگۆڕێ، ههروهك زانایانی ئیسلام زۆر جهخت لهسهر ئهوه دهکهنهوه که بڕوا کهم و زۆر دهبێ.
ئهزموونی ڕاچڵهکین و سهرسوڕمان که ئاین بهرجهستهی دهکا، پانتاییهکی زۆری لهژیانی مرۆڤی بڕوادار داگیرکردووهو مرۆڤ ئهوهندهی لهم حاڵهتهدا ههست بهئارامیی و ئاسوودەیهکی دهروونیی دهکا، ئهوهنده لهجێ بهجێ کردنی فهرمانهکانی ئاییندا ههست بهئارامیی و ئاسوودەیی ناکا " چونکه جێ بهجێ کردنی فهرمانهکان مرۆڤ دهگۆڕن بۆ ئامێرێك که دووری دهخهنهوه لههەر چهشنه نوێ بوونهوەو ڕاچڵهکینێك، بۆیه ههندێ جار جێ بهجێ کردنی ئهرکهکانی ئاین دهبێته جۆره خووپێوهگرتنێك، کهکهسی بڕوادار ههندێ جار بهبێ ئهوهی بهگیانێکی پڕ لهخۆشهویستیی و ههست کردن به نوێ بوونهوەو ڕاچڵهکین، جێ بهجێیان بکا لهلای دهبنه ئهرکێك که ههندێ جار لهجیاتی ئهوهی ههست بهئارامیی و ئاسودەیی بکا، بهبێزارییهوه ئهنجامیان دهدا. ههست کردن بهئارامیی و ئاسودەیی لهکاتی جێ بهجێکردنی فهرمانهکانی خودادا، چهنده پتهوبوونی خۆشهویستی نێوان بهندەو خودایه، ئهوهندهش گوزارشته لهو حاڵهته دهروونییهی که مرۆڤ لهوکاتانهدا ههستی پێی دهکا، کهپهیوەندی به نادیارەوه دهکا. ئهمهتهنیا پهیوهندی بهئایینهوه نییه، مرۆڤ لههونهرو ئهدەب و گهڕان بهدوای داهێنانه زانستییهکاندا ههست به حاڵهتێك لهگهڕان بهدوای نادیاردا دهکا. چ ئهو نووسهرەی پرۆسهی نووسین ئهنجام دهداو چ ئهو کهسهی دهیخوێنێتهوه " ئهو چێژی نووسین و خوێندنهوەیهی ههستی پێ

دەکەن، چێژێکە مرۆڤ لەگەران بەدوای نادیاردا هەستی پێ دەکا. یەکێك لەبەهانەکانی، ئەوانەی نکۆڵێیان لەپەیامی پێغەمبەران کردووە، ئەوە بووە کە پێغەمبەران نادیارەکان ئاشکراناکەن، بۆیە داوای پەرەجوو (المعزە) یان لەپێغەمبەران کردووە. کاتێك قورەیشییەکان بڕوایان بەپێغەمبەری ئیسلام نەهێناوە، بەهانەیان ئەوە بووە، کە پێغەمبەر کەسێکە بەبازاردا دەڕواو نیشانەیەکی پێ نییە، ببێتە هۆی سەرسوڕمان. دیارە کەسی ئاسایی، کەسێکە خاوەنی نادیار نییەو نهێنییەکی پێ نییە ئاشکرای بکا. ئەگەر مرۆڤ بەسروشت حەز بکا، سنووری دیاردە ئاسایی و باوەکان بشکێنێ و بیەوێ ئەو دیوی بینراوەکان ببینێ " ئەوا ئەو حەزو خولیایەی مرۆڤ لەگەڵ پێغەمبەرانی خودادا بەرجەستە بووە، کاتێك ویستویەتی، پێغەمبەروەك کەسێکی ئاسای نەبینێ و کەسێك بێ جیا لەخەڵکی، گەران بەدوای جیاوازیدا، گەرانە بەدوای نهێنی و نادیاردا، کە خەڵکی لەپێغەمبەرانی داوا کردووە. نهێنی و نادیار ڕووی جیاجیان هەیە، هەندێ جار ترس و هەندێ جاری دیکە خۆشەویستی وا لەمرۆڤ دەکەن، بەدوایاندا بگەڕێ. دیاردە ئاسایی و بینراوەکان نابنەمایەی شڵەژان و سەرسوڕمان " بۆیە مرۆڤ دەیەوێ لەوان تێپەڕێنێ و دەرگایەکی دیکەی بەڕوودا بکرێتەوەو ئاسۆیەکی دیکە ببینێ کە بەلایەوە نهێنییەو نامۆیە پێی . بەختیار عەلی دەڵێ: ((نهێنی وەك ئەو ڕەگەزەی هەندێ جار بەرەو شتەکانمان ڕادەکێشێت و هەندێجار لەشتەکانمان دوور دەخاتەوە. هەندێجار ترسمان تیا دروست دەکات و هەندێجار خواستێکی قووڵمان تیا دەبزوێنێت بەرەو ڕووی بڕۆین.))[١٠] ئەو کەسانەی کەلە گوێ گرتنی نامۆژگارییە ئایینییەکاندا هەست بەبێزاری دەکەن، لەبەر ئەوەنییە کە بڕوایان بەو گوتانە لاواز بووبێ "

بەڵکو لەبەر ئەوەیە بۆ چەندەمین جار ئەو گوتانەیان گوێ لێ بووەو ڕەهەندی نادیار لەو گوتانەدا بەدی ناکەن. تەنانەت لەهەندێ جاردا کەئەو کەسەی پرۆسەی ئامۆژگاری ئەنجام دەدا، ئەگەر کەسێك بێ لەبابەتێکی تازە بدوێ، یان کەسێك بێ پێشتر ئەوانەی گوێ ی لێ دەگرن نەیاندیتبێ، ئامادەیی بۆ گوێ گرتن زیاترە. ئەمەش زیاتر لەبەر هەست کردن بەو نادیارییە کە لەلایەن کەسانی گوێگرەوە هەستی پێدەکرێ. نادیار تائەو کاتە خۆشەویستی و نهێنییەکی لەخۆیدا حەشارداوە تا ئاشکرا نەبووە. ئاشکرا بوونی هەر نهێنی و نادیارێك، کۆتایی هاتنە بەحاڵەتی سەرسوڕمان و شڵەژانەو پرسیاریش لەوێدا کۆتایی دێ. پرسیارکردن گوزارشتە لەو حاڵەتەی مرۆڤ کە، دەیەوێ نهێنییەك بدۆزێتەوە. تانهێنی بعێنێ پرسیاریش دەمێنێ و پرسارو نهێنی ئەو دوالیزمەن کە بەتەنیشت یەکەوەن و پەیوەندیان بەیەکدییەوە هەیە. هەر بەتەنیا ئایین نابێتە هۆی شکاندنی ئەو تینوێتییەی کە گیانی مرۆڤ خوازیاریەتی و ڕەهەندێکی نادیاری لەخۆی گرتووە " بۆیە بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، مرۆڤ دوای ئەوەی ئایینی قبولکردبێ، وازی لە پرسیارو گەڕان بەدوای نهێنییەکانی ژیان و بووندا نەهێناوە. لەگەڵ ئایینـدا مرۆڤ دەستبەرداری ئەدەبو هونەر نەبووەو ئەمانیش سەرچاوەی ئەو نادیارەن کە مرۆڤ بەدوایداوێڵە. تەنانەت عارف و سۆفیەناسراوەکانی ناو مێژووی ئیسلامی لەگەڵ ئەو ئایینداری و خوداپەرستییەی ئەنجامیاندلوە، عاشقی شیعرو ئەدەبیش بوون و بەهۆی شیعرو ئەدەبەوە گوزارشتیان لەئاییداری کردووە. مرۆڤ جگە لەئایین بەدوای سەرچاوەی دیکەشدا گەڕاوە، بۆ ئەوەی گوزارشت لەو حەزو تینوێتییەی بکا کەبۆنادیار هەیەتی، بۆ بوارەئەستوورییەکانی (ماددی)

ژیانیشی، کە عەقڵ ڕۆڵی تێدا دەبینێ، وەڵامی چەندین پرسیاری دەستگیر بووە، ئەمەش لەبەر ئەوە نییە کە ئایین نەیتوانیوە، ئەووەڵامانە بە مرۆڤ ببەخشێ " بەڵکو هەر خودی ئایین ڕێگر نییە لەبەرامبەر عەقڵداو ناکۆکی لەنێوان عەقڵو ئاییندا نییە. هەندێك تێزی ئیسلامیوابیردەکەنەوە کە قسەکردنو بایەخدان بە عەقڵ، پشت گوێ خستنی ئایینەو بە ئایینکردنی عەقڵە. پێیانوایە کاتێك خودایەکی داناو زاناو پەروەردگاری جیهانیان بەرنامەیەك بۆ مرۆڤ بنێرێ، ناشێ بەرنامەیەك نەبێ کە سەرجەم بوارەکانی ژیانی مرۆڤ نەگرێتەوەو قبوڵکردنی یاسایەکی دیکە کە بەرەنجامی عەقڵو هزری مرۆڤە، جۆرەهاوبەش دانانێکە بۆ خوداو ئەمەش دژبەبیروباوەڕی یەکخوداپەرستی (التوحید) ە. لای هەندێ کەس ناکرێو ناشێ ئەم جۆرە تێگەیشتنە بخرێتە ژێر پرسیارەوە. لەڕاستیدا ئەم جۆرە تێگەیشتنو ڕوانینە بۆ ئایینوەك چەندین ڕاوبۆچوونی دیکە، بەرهەمی عەقڵو هزری مرۆڤە ناکرێ قسەی مرۆڤیش، هەڵوێستەی لەبەرامبەردا نەکرێو بەگومانەوە سەیری نەکرێ. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە لێکدانەوەو بۆچوونی مرۆڤ بێ هیچ بەڵگەیەکی لۆژیکی دەبێ ڕەتبکرێتەوەو مرۆڤ بۆی نییە لەڕێگەی عەقڵی خۆیەوە بەدوای ڕاستییەکاندا بگەڕێ. بەڵکو مەبەست لەوەیە کە، قسەو بۆچوونی مرۆڤ دەشێ قبوڵبکرێو ڕەتیش بکرێتەوە، نەك بەپیرۆز سەیر بکرێ. کاتێك عەقڵ لەسنوورو تخوبەکانی خۆی دەچێتە دەرێو میتافیزیك دەکاتە بابەتی لێدوانو گفتوگۆ لەسەر کردنو دەیەوێ پەی پێ بەرێو هەوڵ دەدا بگاتە ئەو ڕاستییانەی کە، ئەرکی سروش(الوحی) یە، ڕووبەڕووی قەیرانو تەنگەژە دەبێتەوە، بەپێچەوانەوە هەندێ جاریش ئایین

لەرێگەی هەڵگرانی پەیامەکەیەوە، بەجۆرێك گوزارشتی لێ دەکرێ، کەبۆتەوە هاتووە کە سەرتاپای ژیان بگرێتەوەو قسە لەسەر ئەو بابەتانە بکاو ئەو بوارانە بگرێتەوە، کە ئاینی ئەو ئەرکەی پێ نەسپێررلوە. لێرەدا عەقڵ دەستەوەستان دەبێو ناهێڵرێ جوڵە بکاو لەبوارو سنوورەکانی خۆیدا رۆڵی دیاریکراوی خۆی ببینێ. بەرپرسیارکردنی ئاینی بەئەرکێك کە پێی نەسپێررلوە، سەندنەوەی ئەرکێك لەعەقڵ، کە پێویستە رۆڵی خۆی تێدا ببینێ، بەدرێژایی مێژوو یەکێك بووە لەوکێشەو تەنگەژانەی کە هەڵگرانی پەیامی ئاینی لەگەڵ عەقڵگەرلو بزووتنەوە رۆشنگەرییەکاندا رووبەرووی یەکدی کردۆتەوە. ململانێی نێوان ئەم دووانە بەدرێژای مێژوو،شێوازی جۆراو جۆری بەخۆیەوە گرتووە. ئەم مل ملانێیە لە قۆناغی رۆشنگەری ئەورووپادا یەکلا بۆوە. لە مێژووی ئیسلامیشدا، ململانێی نێوان ئەم دوو بۆچوونەو دیدەلێك جودایە، بە چەندین شێوازی جۆرلوجۆر گوزارشتی لێ کراوەو لەدەرەنجامدا چەندین قوتابخانەو رێبازی فکریی جیاجیا سەریان هەڵداوە.

ئایدۆلۆژیاو دەسەڵاتیش، لەم ململانێیەدا دوورەپەرێز نەبوونو هەوڵیانداوە فکرو مەعریفە بۆ مەبەستی تایبەتی بەکاربهێننو لەو ئەرکە دووری بخەنەوە کە پێویستە لەپێناویدا کاربکا. لەگەڵ هاتنی هەر ئاینێکدا رووبەروو بوونەوەو بەربەککەوتنێك لەگەڵ ئاینو عەقڵدا دەستی پێ کردووە. کاتێك مرۆڤ بەئەندازەی عەقڵی خۆی ژیانو بوونی لێکداوەتەوەو جۆرە تیۆرێکی لەو بارەوە لەلا فۆرمەلە بووە، کە بەرەنجامی ئەو روانینو تێگەیشتنە بووە لە ژیانو بوون. لەو کاتەدا پەیامێکی خودایی لە دەرەوەی ئەم تێگەیشتنو روانینەی مرۆڤ دێت،

ڕاستییەکی دیکەی پێیبیە، کە جیایە لەو ڕوانین و بۆچوونەی مرۆڤ پێشتر بڕوای پێ بووە. لێرەدا مرۆڤ لەبەرامبەر عەقڵی خۆیدا هەستی بەنامۆ بوون کردووەو بەگومانەوە سەیری ئەو بۆ چوونانەی خۆی کردووە. وەرگرتنی بیروڕایەکی نوێو ڕەتکردنەوەی بیروڕایەك کە مرۆڤ بڕوای پێ بووبێ، مرۆڤی ڕووبەڕووی شۆك (الصدمە) کردۆتەوە. ئەم حاڵەتە کەمرۆڤی خستۆتە نێوان دوالیزمی قبوڵکردن و ڕەتکردنەوە، لەڕاڕایی و گوماندا بەرجەستە بووە. بڕواهێنانی کەسێك کە بۆیەکەم جار لەنێوە دورگەی عەرەبی، پەیامی خودایی پێدەگا، جیایە لە بڕواهێنانی ئەوانەی دوای چەندان سەدە، ئایین لەناویاندا ژیاوەو بەشێك لەهۆشیاری و کلتوری ئەوانی پێك هێناوە. ئەم هەست کردن بەنامۆیی و گومانە زیاتر لەوانەی کەلە سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامیدا بڕوایان هێناوە، بەرجەستە بووە، وەك لەوانەی دوای چەندین سەدە بڕوایان هێناوە، تەنانەت بڕوای ئەوانەی دواتروەك حاڵەتێکی ئاسایی و سروشتی بووەو حاڵەتی ڕامان و شڵەژانی کەمتر بووە. بڕوا هێنان بە بیروباوەڕێك کە ناسراوەو خەڵك پێی ئاشنایە " جیایە لەبڕواهێنانێك کە مرۆڤ بۆیەکەمجار بەو بیروباوەڕ ە ئاشنا دەبێ و بڕوای پێدێنێ. جائەو بیروباوەڕە ئایینی بێ یان نا. ئەوانەی ئێستا باسی چیرۆکی ئەو قورەیشیانەیان بۆدەکرێ، کەبەئاسانی بڕوایان نەهێناوەو سەرکەشییان لەگەڵ پێغەمبەردا کردووە. بەلایانەوە مایەی سەرنج و تێبینییە، کەچۆن بڕوایان بەو پێغەمبەرە دەستپاك و ڕاستگۆیە نەکردووە؟ بەڵام کاتێك دیمەنی ئەو کاتە بێنینە بەرچاومان، ڕوانینمان بۆ ئەو کەسانەی کەبڕوایان نەهێناوە دەگۆڕێ، لەکاتێکدا کە محەمەد بۆیەکەمجار، هەواڵی پێغەمبەرایەتی خۆی بڵاودەکاتەوە، بۆکەسێك بڕواهێنان ئاسان

نییە، کەلەگەڵ بیروباوەڕو کلتوریکی دیکەدا ڕاهاتووە، جیایە لەو ڕوانینو جیهانبینییەی کە پێغەمبەر لەچوارچێوەی پەیامەکەیدا هێناویەتی. متمانەکردن ئەوکاتە گەشە دەکا، کە پێغەمبەروردەوردە دەست دەکا بەبلاو کردنەوەی پەیامەکەی‌و چەندین پەرەجوو(المعجزة) نیشان دەدا. بێ هۆنی یە، کە ئەوانەی لەسەرەتای بلاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامدا بڕوایان هێناوە، بەپەنجەکانی دەست دەژمێررێن‌و مێژووی ئیسلامیش بەشانازییەوە ناویان دێنێ. ئەمەش پاساو نییە بۆ ئەو بێ بڕوایانەی کەلەسەرەتای بلاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامدا، لەپێغەمبەر یاخی بوون‌و دژایەتییان کردووە. سەرکەشی‌و دوژمنایەتی کردنی ئەوانە لەگەڵ پێغەمبەرو پەیامەکەی، هەرتەنیا لەسەرەتادا نەبوو " بەڵکو دوای ئەوەی پێغەمبەر بەچەندین بەلگەو نیشانە ڕاستی پەیام‌و پێغەمبەرایەتییەکەی، سەلماند، ئەوان لەسەر دژایەتی کردن‌و دوژمنایەتی کردنی پێغەمبەرو ئاینەکەی هەر بەردەوام بوون. ئەو گوتارە ئیسلامییەی کە خۆی بە شوێنکەوتەی پێشینایەتی (السلفیە) دەزانێ‌و پێی وایە بەپەیڕەو کردنی لەدەقەکانی قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د. خ) خۆی لەڕوانینی عەقڵانی پاراستووە، بیەوێ‌و نەیەوێ، پەیرەوی جۆرێك لە عەقلانییەت دەکا، بۆیە بەعەقڵانیکردنی ئاین‌و ڕوانینێکی عەقڵیانە بۆ دەقەکانی ئاین، دیاردەیەکی بەردەوامی مێژووی مرۆڤایەتییە، کەلەگەڵ ئاینە یەك لە دوای یەکەکاندا هەنگاوی ناوە. ئەگەر بەهانەو پاساوی ئەم گوتارە پابەندبوون‌و لانەدان بێ لەدەقەکانی قورئان‌و فەرموودە، کاتێك ڕوانین‌و بۆچوونەکانی دەردەبڕێ‌و ڕاڤەی ئەو دەقانە دەکا، ئەم پرۆسەیە لەدواجاردا، دەبێتە پرۆسەیەکی عەقلانی. جیاوازی نێوان قوتابخانە جیاجاکانی مێژووی ئیسلامی، جیاوازی نێوان

بۆچوون و لێکدانەوەی جیاجیابووە بۆ دەقەکانی ئیسلام. ئەگەر یەکێك لەو قوتابخانەو ڕێبازانە خۆی بە ئەرسەدوکسێکی ئیسلامی بزانێ و پێی وابێ ئەو لەوانی دیکە باشتر لەدەقەکان گەیشتووە، ئەوا دەیەوێ فیکرو مەعریفەو لێکدانەوەیەکی تایبەت بەزۆر بسەپێنێ. زۆر جار لەمێژووی ئیسلامدا ئەم ململانێ فکری و مەعریفییە، بووەتە ململانێ ی سیاسی و دەسەلات، چەندان بیریارو زانای ئیسلامیی ڕووبەڕووی ئازارو ئەشکەنجە بوونەتەوەو بیروڕاکانیان دوور لەکەش و هەوایەکی ئازادانەو کراوەدا قبوڵنەکراوە. لەکلتورو مێژووی ئێمەدا، دوو پرۆژەو تێزی وەك موعتەزیلەو ئەشعەری، کەبە ململانێیەکی فیکری و مەعریفی دەستیان پێکردو زەمینەیان سازکرد بۆ گەشەکردن و فورمەلەبوونی قوتابخانەو ڕێبازی عەقلانی، لەدواییدا دەسەلات هەر یەکێکیانی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی بەکار هێنا. کاتێك ئەو دەسەلاتەی فەرمانڕەوایی دەگرتەدەست و موعتەزیلەی دەکردە ستراتیژی خۆی،لەبەرامبەردا دژ بەهەر دەنگێك دەوەستا موعتەزیلەی ڕەت دەکردەوەو کە پێچەوانەی موعتەزیلە بوایە. کاتێکیش دەسەلاتێکی دیکە دەهات بۆ قایمکردنی کورسی دەسەلاتی خۆی و سەلماندنی بوونی خۆی ئەشعەریانە بیری دەکردەوە. ئەو بیریارو ڕۆشنبیرانەی کە دروشمی فیکری و مەعریفیشیان بەرزکردۆتەوەو بەمەبەستی گەشەپێدان و بەرەوپێشەوە بردنی پرۆژەی عەقلی و فیکریی، کاریان کردووە، نەیانتوانیوە لە کاریگەری هێزە دەسەلاتخوازەکان بەدووربن و لە پرۆسەی عەقلی و کارەمەعریفییەکانیاندا، سێبەری دەسەلاتیان بەسەرەوە بووە. هەندێکیان لەژێر ئەو سێبەرەدا پاساویان بۆ دەسەلات هێناوەتەوەو هەندێکیشیان لەژێر ئەو سێبەرە هاتوونەتە دەری و باجی ململانێیان

لەگەڵ دەسەڵاتدا دلوە. ئەوەی ئەم گرفتەی قوڵترکردۆتەوە، ئەوە بووە کەقسەکردن بەناوی تیۆرو فیکرێکەوە، ڕەهەندێکی شاییانی پێ بەخشراوە، بۆیە ئەوانەی دژ بەو فیکرو بۆچوونانە وەستاون، بەوە تاوانبارنەکراون کە دژ بەدەسەڵاتو فیکرەی دەسەڵاتن، بەڵکو بەلادەر لە ئایین ناوزەدکراون. بە پێچەوانەشەوە تیۆرو بۆچوونێکی ئیسلامی کەدەسەڵاتێکی لەپشتەوە بووبێ. یان لەلایەن زانایەکی ئیسلامییەوە، کە بەخواناس و شارەزا ناسرابێ، بانگەشەی بۆ کرابێ، وەك ئەرسەدو کسێکی ئیسلامی مامەڵەی لەگەڵدا کراوەو جۆرە پیرۆزییەکی پێ بەخشراوە. هەندێ جار قسەی زانایەك یان پشتگیریکردنی تیۆرێك لەلایەن دەسەڵاتەوە، بەس بووە بۆئەوەی ئەو تیۆر یان قوتابخانەیە بەرگێکی پیرۆزی بەبەردابکرێ، یان ڕەت بکرێتەوە. ئەگەر تیۆرو قوتابخانەیەك ڕەتکرابێتەوە یان قبوڵکرابێ، بەرەنجامی چوارچێوەو میکانیزم و میتودیك نەبووە کە، بۆ هەڵسەنگاندن و ڕاڤەکردنی هەر تیۆرو قوتابخانەیەکی فیکری و فەلسەفی و ئەدەبی پێویستە. ڕاڤەکردنی هەر دەقێك کە، ئایدۆلۆژیاو دەسەڵاتێکی لەپشتەوە بێ، جیایە لەو ڕاڤەکردن و گفتوگۆکردنەی کەلەسەر هەمان دەق دەکرێ، لەکەش و هەوایەکی دوور لەئایدۆلۆژی و گوتاری سەپاو. دەرەنجامی هەر یەکێك لەم دوو لێدوان و ڕاڤەکردنە جیایە. لێکدانەوەو ڕاڤەکردن و خوێندنەوەی فەیلەسوف یان بیریارێك بۆ فەلسەفەی مارکسی جیایە لەو لێکدانەوەو بۆچوونەی سیاسی و هەڵگری پەیامێکی ئایدۆلۆژی کە بۆ مەبەستی مەرامەکانی دەسەڵات، ئاراستەی هەمان تیۆری دەکا. خوێندنەوەی ئالتوسێرو ئەریك فرۆم و چەندانی دیکە، جیایە لەو خوێندنەوەو ڕوانینەی کەسانی سیاسی و بۆمەبەستی بەهێز کردنی ئایدۆلۆژی خۆیان بۆ مارکس

ئەنجامیان داوە. دەقی ئایینیو تێزو بۆچوونە ئایینییەکانیش بەھەمان چاوەوە سەیریان دەکرێو دەست تێوەردانی دەسەلاتو گەمەو چالاکییە سیاسییەکان ڕۆڵیان ھەیە لەگۆرینی بۆچوونو ڕوانینە فکرییو مەعریفییەکاندا. نەك ھەر ئەمە، خەیاڵدانو ھۆشیاری خەلکیش ڕۆلی ھەیە لەبەخشینی پێناسەیەکی دیکەی جیا لەو پێناسەیەی کە لەناوەندو ئاستێکی ھۆشیاری دیکەدا بەو تێزوبۆچوونە دەدرێ. بەخشینی ماناو پێناسەیەکی دیاریکراو بەچەمكو گوتەزایەك لە کەشو ھەواو زەمینەو باروبۆخێکی ناھەموارو دژوارو نائارامدا، جیایە لە کەشو ھەواو زەمینەیەکی ھێمنو ئارامدا. زۆر جار بیریارو فەیلەسوفێك لە ھەلو مەرجو باروبۆخێکدا بانگەشە بۆ جۆرە ڕوانینو تێزێك دەکا، دوایی ئەنجامی گۆرانی ئەو ھەلو مەرجو باروبۆخە، لەو بیروڕایەی خۆی پاشگەز دەبێتەوە، یان بانگەشە بۆ جۆرە ڕوانینو بیرۆکەیەکی دیکە دەکا. خوێندنەوەو ڕاڤەکردنی دەقی ئایینیش لەم یاسایە بەدەر نییە، ئەوە ڕوانینو بۆچوونی خەڵكوکۆمەلگەیە، کەدەقێکی ڕاڤەکراو دەخاتە چوارچێوەیەکی دەست لێنەدراوو بەبێ ھیچ گۆرانکارییەك ئەوەیەك دەیداتە دەست ئەوەی دوای خۆی. چ پەیوەندی نێوان ئایینو عەقلو چ ململانێی نێوانیان، شێوازی جۆراوجۆری لە مێژوودا بەخۆیەوە گرتووە. ئەم پەیوەندیو ململانێیە لەولاتێکەوە بۆولاتێكو لەفەرھەنگو کلتورێکەوە بۆ فەرھەنگو کلتورێكو لەسەردەمێکەوە، بۆ سەردەمێکی دیکە بە چەندینوێنەی جیا دەرکەوتووە. چەندین عەقلی دوگماو دژ بەھەر پرۆژەیەکی چاکسازییو گۆرانکاری، لەئەنجامی ڕاڤەو لێکدانەوەیان بۆ ھەریەکێك لە ئایینوعەقل ڕوخساری ھەریەکێك لەمانەیان شێواندووە. ئەفلاتون مرۆڤ لەسێ پێکھاتەدا دەبینێ، کە بە

هۆی ئەو سێ پێکهاتەوە ئاڵوگۆڕو کارلێك کردنی نێوانیان، هەڵس‌و کەوت‌و ڕەفتاری مرۆڤ دیاری دەکرێ. بەلای ئەفلاتونەوە ئەم سێ پێکهاتەیە لەمرۆڤدا هێزەکانی هەوەس (النفس الشهوانیة)و توڕەیی (النفس الغضبیة)و عەقڵە (النفس العاقلة). هەریەکێك لەم هێزانە لە سنووری تایبەتی خۆیدا ئەرك‌و لێپرسراوێتی هەیە. مرۆڤ کاتێك دەبێتە بوونەوەرێکی خۆویست‌و نەوسن‌و ئارەزووباز، کە هێزی هەوەس زاڵبوو بەسەریداو لە سنووری دیاریکراوی خۆی تێپەڕاند. ئەگەرولنەبوو ئەوا ئەو هێزەش‌وەك هێزەکانی دیکە بۆ مرۆڤ پێویستە، ئارەزووی خواردن‌و خواردنەوەو زایەند (سێکس)و ئاوەدان کردنەوەی زەوی‌و ئەولنی دیکە، کەبەشێکن لەو ئارەزووە، پێویستن، بەلام لەهەندێك حاڵەتدا، کە لە سنووری خۆیان لایاندا، دەبنە هێزی خراپ‌و مرۆڤ دەگۆڕن بۆ بوونەوەرێکی چاوچنۆك‌و خۆویست‌و نەوسن. توڕەیی‌و توسنی، کاتێك بەچاکە دەژمێررێ کە، ببێتە هۆی ئازایەتی‌و جوامێری، ئەمیش پێویستە لەحاڵەتێکدا بهێڵرێتەوە، کە لە خۆگری (العفة) بەدوور نەبێ، ئەگەروانەبێ، ئەوا ئەویش مرۆڤ بەرەو شەرەنگێزی دەبا. هێزی عەقڵ بەلای ئەفلاتوونەوە گرنگترینیانەو پێی وایە، دەبێ دوو هێزەکەی دیکە لەژێر چاودێری عەقڵدابن. ئەفلاتون لەشارە ئایدیالی و نموونەییەکەیدا، ئەو هێزە، کە هێزی عەقڵە بە هێزی سەرەکی دەزانێ‌و ئەرکی سەرپەرشتی کردن‌و ڕێنوێنی کردنی دوو هێزەکەی دیکەی پێ دەسپێرێ. لاوازبوونی دەسەلاتی عەقڵ یەکێکە لەو هۆکارانەی، کە دەلاقە بەڕووی هێزی غەریزەو هەوەس‌و ئارەزووە ئەستوویی (ماددی) یەکانی مرۆڤدا دەکاتەوەو لەم حاڵەتەدا، ئەم ئارەزووانە مرۆڤ دەگۆڕن، بۆ بوونەوەرێکی، شەڕەنگێزو خۆویست‌و دووری دەخەنەوە لە ئاکاری

چاكو بەهای بەرز. لەوكاتەدا عەقڵ ئەو ناوبژیوانەیە كە دەست دەخاتە ناو هەرێمی ئەو دوو هێزەوەو هاوسەنگییان لەنێواندا ڕادەگرێ. دیارە عەقڵی مرۆڤەكانیش لەیەكدی جیایەو ئاستی تێگەیشتن و زانین و دانایی خەڵكوەك یەك نییە " بۆیە ئەفلاتوون فەیلەسوف بەو عەقڵە دەناسێنێ و متمانەی ئەوەی پێ دەكا، كە بتوانێ فەرمانڕەوایی دەوڵەت بكا. جگە لەفەیلەسوف كە ئەفلاتوون ئەو شوێنگەیەی پێ دەبەخشێ، لەناو كۆمارەكەیدا شوێنی عەقڵەكانی دیكەش دیاری دەكا. هەر چین و توێـژەی نێودەوڵەتشارەكەی ئەفلاتوون بەكاری تایبەتی خۆیان هەڵدەستن و كەس دەست ناخاتە ناو ئیش و كاری كەسەوە، ئەگەروانەبێ ئەوا ئەو دادگەرییەی ئەفلاتون بانگەشەی بۆدەكا، نایەتەدی. ئەگەر دەوڵەت، وێنەی مرۆڤ بێ و لە مرۆڤیشدااوا پێویست بێ عەقڵ فەرمانڕەوای جەستەو بەشەكانی دیكەی پێكهاتەی مرۆڤ بێ، ئەوا لەدەوڵەتیشدا بەهەمان شێوە، پێویستەعەقڵ فەرمانڕەوا بێ، ئەو عەقڵەش، عەقڵێكی ئاسایی نییە " بەڵكو عەقڵی فەیلەسوفە"[؟]. چەمكی عەقڵ لەلایەن، بیرمەندو زانا ئیسلامییەكان و قوتابخانە جۆراوجۆرەكانی مێژووی ئیسلامی، بەچەندین شێواز گوزارشتی لێ كراوەو بووەتە مایەی لێدوان و گفتوگۆی نێوان هەریەك لە قوتابخانەی سۆفیگەری و موعتەزیلەو ئەشعەری. عەقڵ بەلای ماوەردی و زۆربەی ئەو زانایانەوە، دووبەشە، عەقڵێك كە بە عەقڵی پێویست(ضروري) ناوزەدی دەكەن، ئەویش ئەو عەقڵەیە كە بەرەنجامی ڕامان و ئەزموونی مرۆڤ نییە " بەڵكو عەقڵێكە بەدەر لەویستی مرۆڤ، عەقڵێكە مرۆڤ بە هەوڵ و كۆشش وەدەستی نەهێناوە، بەشێكە لەسرووشت و زگماكی مرۆڤ، كاتێك كەسێك چاودەكاتەوە، بەبێ هیچ ویستێكی ئەو كەسە چاوی بەدرەخت،

ڕووبار، هەرشتێك دەكەوێ كە لەبەردەمیدایە، خەڵك لەوەدەست هێنـانی زانیاری بەهۆی ئەم عەقڵەوەهەموویان وەك یەكن. زلنین و زلنیاری بەهۆی ئەم عەقڵەوە، پەیوەندی بـەڕادەی هۆشـیاریو ناهۆشـیاریو ئـەزموونی مرۆڤەوە نییە، عەقڵی دووەم عەقڵی وەدەست هێنـراوە (المكتسـب) ئـەم عەقڵە سنوورێكی دیاری كراوی نییە، وەك عەقڵی یەكەم نییـە بـەدەربێ لەویستو ڕۆڵی مرۆڤ، خەڵكی لەم عەقڵەدا لەیەكدی جیـان، ئـەم عەقڵـە بەردەوام لەزۆری و كەمیدایەو لەیەكێكەوە بۆ یەكێكی دیكە دەگـۆڕێ[11].

لـەكلتوری ئیسـلامیدا عـەقڵ ئـەو پێگەیـەی پـێ بەخشـراوە، كەبووەتـە سەرچاوەی ئاكـار، جیاكردنـەوەی چـاكەو خراپـەو جـوانیو ناشـیرینیو دەست نیشانكردنی هەریەكێك لەمانەو مانا پێ بەخشینیان، پرۆسەیەكی عەقڵییـەو تەنانـەت موعتـەزیلـە لەوبڕوایـە دابـوون كـە بۆناسـینی خـوداو جیاكردنەوەی كرداری چاكو خراپو پـەیرەوی كـردن لـە ئاكاری چـاكو دووركەوتنەوە لـە ئاكـارو ڕەوشـتێك كـە خـراپو ناپەسـندە، پەیوەنـدی بەعەقڵی مرۆڤەوە هەیە " ئەگەر خودا پەیامیشی نەناردبایە مرۆڤ بـەهۆی عەقڵـــەوە، ئاكـــاری چـــاكو خـــراپ لەیەكـــدی جیـــادەكردەوە.

ئەشعەرییەكانیش تاڕادەیەك ئەوڕایەی موعتەزیلە دەسەلمێنن، كـە مـرۆڤ بـــەهۆی عەقڵـــەوە دەتـــوانێ چـــاكەو خراپـــە بناســـێ و لەیەكـــدییان جوردابكاتـــەوە " بـــەلام ئـــەوان پێیان وایـــە ئەنجامـــدانی كـــارێكی چـــاكو دووركەوتنـــەوە لـــەكاری خـــراپ، كاتێـــك دەبێتـــە ئـــەركێك لەســـەر مـــرۆڤ، ئەمەیان ئەركی ئایینە نەك عەقڵ. كەواتە بەڕای ئەشعەرییەكان ناسـینی چاكەو خراپە لەڕێگەی عەقڵەوە، نابێتە ئەركو فەرمانێك بۆ ئەوەی مرۆڤ جـێ بـەجێی بكـا، بـەلام ئـایین ئـەو چـاكەو خراپەیـەی كـە عـەقڵ ناسـیویەتی، دەیگـۆڕێ بـۆ ئـەركێك لەئەركـەكانی ئـایین. ئـایین تـەنیا

بەوەندەواز ناهێنێ کەئاکاری چاکو خراپ بەمرۆڤ بناسێنێ، بەڵکو ئەو ئاکارە جوانو ناشیرینو کردەوە چاکو خراپانەی مرۆڤ بەهۆی عەقڵو رامانی خۆیەوە لەیەکدییان جیادەکاتەوە، دەکا بەئەرکێکی ئایینی. رۆڵی پێغەمبەرانیش ئەوەنەبووە ئاکاری چاکو خراپ بۆ مرۆڤ روون بکەنەوەو پێی بناسێنن " بەڵکو ئەوان ئاکارە چاکو خراپەکانیان بەهۆی پەیامی خوداوە لەناسینەوە گۆڕیوە بۆ ئەرکێکی ئایینی. ئەگەر چی لەکلتوری ئیسلامیدا، ئایین پانتایەکی زۆری پێ بەخشراوە " بەلآم ئەمە نەبۆتە هۆی ئەوەی کە، بواری کارو چالاکییەکانی عەقڵ بخرێتە پەراوێزەوەو مامەڵەیوەک پێویستی لەگەڵدانەکرێ. راستە بەهۆی ئەو پاساوەی کە، ئایینوەلآمگۆی پرسیارە چارەنوسسازەکانی مرۆڤە، ئەمە لەلای هەندێك ئەمە لەلای هەندێك لە بیرمەندو بیریاری ئیسلامیی پاساوێك بووە، بۆ ئەوەی عەقڵ بخرێتە پەراوێزەوە. ئەوانەی لەمێژووی ئیسلامیدا، باسی ئاکاریان کردووە دانیان بەوەداناوە، کەچێژو خۆشی (اللذة) هەڵسو کەوتو ئاکاری مرۆڤ دیاری دەکاو رۆڵی هەیە لە ئاراستە کردنی مرۆڤ بەرەو ئەوەی جۆرە رەفتارێك بنوێنێ " بەلام لەکۆتاییدا جیاکردنەوەی ئاکارو رەفتارەکانی مرۆڤو دەست نیشانکردنی ئەوەی کە ئەم کردەوەیە چاکەو ئەمەیان خراپە " کاری عەقڵەو عەقڵ دەتوانێ چاکو خراپ لەیەکدی جیابکاتەوە. سەرچاوەی کارەخراپەکان لە لای بیرمەندە ئیسلامییەکان ئارەزوو(الهوی) یەو سەرچاوەی کاری چاکەو باشیش دەگەرێتەوە بۆعەقڵ. لە کلتورو شارستانیەتی ئیسلامیدا ئایین سەرچاوەی ئاکار نییە، ئەگەر هەندێك لە بیریارانی ئیسلامی ئەم بیرۆکەیەویژدانی ئایینییان ئازار دەداو پێیان قبوڵناکرێ، ئەوە دەسەلمێنن کەبەتەنیا، ئایین سەرچاوەی ئاکار نییە لە کلتوری

ئیسلامیدا. (قازی عەبدولجەبار) یەکێکە لە بیرمەندانی (موعتەزیلە) پێی وایە جیاکردنەوەی کارێکی چاك لەخراپ، بەهۆی عەقڵی غەریزییەوەیە، کەبە عەقڵی پێویست (ضرورة) ناوی دەبا،

یان بەهۆی عەقڵیوەدەست هێنراو (المکتسب)ەوە دەبێ. ئەگەر بەهۆی یەکێك لەم دوو عەقڵەوە نەبێ نازانرێ، چونکەوردبوونەوەو بەڵگەگەرایی (النظروالاستدلال) لەلایەن کەسێکەوە، ئەنجام دەدرێ کەعەقڵی تەولوبێ، ئەمەوا لەوکەسە دەکا، کە لێپرسراوبێ بەرامبەر کردەوەکانی. لێرەدا دەردەکەوێ کە موعتەزیلەکان، پێگەیەکی گرنگ بەعەقڵ دەبەخشن. عەقڵ لەلای ئەوان، سەرچاوەی ئاکارە. ئەوەی کرداری چاکەو خراپە لەیەکدی جیادەکاتەوە، عەقڵە. ئەوەی بەلای سۆفیگەراو عاریفەکانیشەوە گرنگەو لەجیاتی عاقڵ بەکاری دێنن، عاریفە. کەسی عاریف پێویستی بەچەندین پلە هەیە، تادەگاتە حاڵەتێك، ڕاستییەکانی بۆ ئاشکرا دەبن‌و زانین بەدەست دێنی". سەرچاوەی زانین لای عاریف‌و سۆفیەکان عەقڵ نییە " بەڵکو دڵە. کەسی عاریف کە، خولیای گەیشتن بەخۆشەویستەکەیەتی‌و بەدوای زانینداوێڵەو ڕێگەی گەیشتن بەمەرامەکانی دەگرێتەبەر، سەرەتا خۆی لە ئارەزووە جەستەییەکان دوور دەخاتەوەو دەکەوێتەجەنگێکی درێژخایەن لەگەڵ خۆیدا، سەرکەوتن بەسەر خودا، ئەو هەنگاوەیە، کەکەسی عاریف دەگەیەنێتە مەبەست‌و مەرامەکانی. کاتێك عاریف‌و سۆفیەکان بڕوایان‌وابێ مرۆڤ لەڕێگەی بەسەرخودا زاڵبووندا دەگاتە زانین‌و زانیاری بەدەست دێنێ، کەواتە عەقڵ لەڕوانگەی ئەوانەوە ئەوڕۆڵەی نییە. لەکلتوری عەرەبیدا، زمان‌و عەقڵ ئەو دوالیزمەن، کەلە یەکدی جیاناکرێنەوەو هەریەکەیان، کاریگەری لەسەر ئەوەی دیکە

هەیە، وەك چۆن لاشە لە خوێن و گۆشت پێك دێ، زمان و عەقڵیش بەهەمان شێوە.

زمان بەبێ رێنوێنیکردنی عەقڵ، لەچەند دەنگێکی بێ مانا زیاتر هیچی دیکە نابەخشێ. ئەم بیرۆکەیە، ڕوانینی یۆنانییەکانمان بیردێنێتەوە، کە لۆژیك و زمان بەیەکەوە گرێدەدەن. لەپەندو قسەی نەستەقی عەرەبیدا، ئەم گوتەیە، زۆر دووبارە دەبێتەوە کە دەڵێ: ((عەقڵ هاوڕێ ی مرۆڤەو نەزانینیش دوژمنیەتی)). (جابری) پێی وایە، یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی کلتووری عەرەبی ئەوەیە، کەکەڵکی لەسەرجەم کلتورەکان وەرگرتووە، بۆیە خاوەنی رێبازێکی ئایینی تایبەت نییەو دەرگای بەڕووی ئایین و بۆچوونە جیاجیاکاندا کردۆتەوە. چۆن لەقۆناغی نەفامێتیدا، مامەڵەی لەگەڵ بۆچوونەکانی دەوروبەردا کردووە، دوای هاتنی ئیسلامیش، باوەشی بۆ ئەمیش کردۆتەوەو بەرامبەر بەشارستانیەتیيەکانی دیکەش بەهەمان شێوە[١٢].

## عەقڵ و ئاکار

مرۆڤ چەندە خاوەنی ئەو سروشتەیە، کەبەهۆیەوە کاری چاکە ئەنجام دەدا، لەهەمان کاتدا ئەو سروشتەش لە مرۆڤدا بەرجەستەیە، کەبەرەو شەڕەنگێزیو خراپەکاری دەبا. کاتێک جابری باسی ئاکار دەکا، لەکلتوری عەرەبیدا پێنج سەرچاوە دیاری دەکا، کە ئاکارو ڕەوشتیان لەو کلتورەدا ئاراستەکردووەو بەهۆیانەوە ئاکار لە کلتوری عەرەبیدا فۆرمەلە بووە. ئەوانیش:

١- کەلەپوری عەرەبی پوختە. (الموروث العربي الخالص).

٢- کەلەپوری ئیسلامی پوختە (الموروث الأسلامي الخالص).

٣- کەلەپوری فارسی (الموروث الفارسي).

٤- کەلەپوری یۆنانی (الموروث اليوناني).

٥- کەلەپوری سۆفیگەرا (الموروث الصوفي).

کەلەپوری هەریەک لەمانە، لەیەکدی جیایەو هەر یەکەیان، خاوەنی جۆرە ئاکارێکە، کە تایبەتمەندی خۆی هەیەو لەوانی دیکەی جیادەکاتەوە.

مرۆڤوێرای عەقڵ و سۆزو غەریزە، خاوەنی چەندان ئاکاری چاک و خراپە، زانایانو بیریاران هەریەکەیان بەجۆرێک سروشتی مرۆڤیان پێناسە کردووەو خوێندنەوەی هەریەکێکیان دەربارەی سروشت و ئاکارەکانی مرۆڤ لێک جیایە. هەندێکیان لەو بڕوایەدان کە مرۆڤ لەسروشتی خۆیدا چاکە خوازەو هەندێکی دیکە خەسڵەتی شەڕەنگێزیو خراپەکاری دەدەنە پاڵ مرۆڤو پێیانوایە مرۆڤ لەسروشتی خۆیدا خراپ و شەڕەنگێزە.

ڕەواقیەکان، لەوبڕوایەدابوون کەمرۆڤ چاکە خوازەونەوەیوا لە مرۆڤ دەکا، ئەو سروشتە چاکەی بگۆڕیێو بیکا بە بوونەوەرێکی خراپ، کۆمەڵگەو ئەو دەوروبەرو ژینگەیەیە کەتێیدا دەژی. کەسانێکی دیکەش لەپێش ڕەواقیەکاندا، پێیان‌وابوو مرۆڤ بوونەوەرێکە لە سروشتی خۆیدا خراپە، بەڵام بەهۆی ئامۆژگاریو پەروەردەوە دەتوانرێ، ئەم سروشتە خراپیەی مرۆڤ بگۆڕیێ بەرەو چاکە خوازی[٦٨]. ئەرستۆ بڕوای بەوە نەبوو، کەمرۆڤ خاوەنی ئاکارو ڕەوشتێکی نەگۆڕ بێو پێی‌وابوو، ڕەوشتو ئاکاری خراپیمرۆڤوەك خۆی نامێنێتەوەو بەهۆی ئامۆژگاریو پەروەردەوە، لەحالەتێکەوە دەگۆڕیێ بۆ حالەتێکی دیکە، ئەمەش پێویستی بەئامۆژگاریو پەروەردەیەکی بەردەوام هەیە، چونکە گۆڕانی مرۆڤ لە خراپیەوە بۆ چاکی کارێکی ئاسان نییەو ئەمەش بەئەندازەی ئامادەیی ئەو کەسە بۆ گۆڕنکاری دەگۆڕیێ. زاناو بیرمەندە ئیسلامییەکان، وەك چۆن لەباسی عەقڵدا، دوو جۆر عەقڵیان دەست نیشان کردووە، یەکێکیان عەقڵی پێویست (الضرورة)و ئەوی دیکەش عەقڵی بەدەستهێنراو (المکتسب). ئەوا لە بواری ئاکاریشدا هەندێکیان پێیان‌وابوو، ئاکار لە مرۆڤدا سروشتییەوبۆ ئەم مەبەستەشیان ئەو ئایەتو فەرموودانەیان دەکردە پاڵپشتی ڕاکانیان، کە پشتگیریان لەو بۆچونەیان دەکرد. هەندێکی دیکەش ڕایان‌وابوو کە، ئاکار لە حالەتێکی جێگیرو نەگۆڕدا نامێنێتەوەو بەهۆی ئامۆژگاریو پەروەردەوە، دەتوانرێ ئاکارو ڕەوشتی مرۆڤ لە خراپەوە بەرەو باشە بگۆڕیرێ. قسەکردنو ڕا دەربڕین، دەربارەی سروشتی چاکە خوازانە یان خراپی مرۆڤ، لەدوای یۆنانیەکانیش لەلایەن بیریارو فەیلەسوفانی ئەورووپا گوزارشتی لێ کراوە. چەمکی (جەنگی هەمووان دژی هەمووان)ی هۆبز

گوزارشتە، لەسروشتی خرا پو شەڕەنگێزی مرۆڤ. یەکێکی وەك ڕۆسۆش بەپێچەوانەی هۆبزەوە، مرۆڤ بەبوونەوەرێکی بەسروشت چاکە خـواز، پێناسە دەکا.

بینینی دیوی چاکەخوازی مـرۆڤ، وای لەهەندێك بیریارو فەیلەسوف کردووە، کەدیوە خراپو شەڕەنگێزییەکەی مرۆڤ نەبینین. هەلو مەرجو بـارودۆخی سیاسـیو کۆمەڵایـەتیو ئـابووری، ڕۆڵو کاریگـەری خۆیـان هەیە، لەدیاریکردنی فکرو بۆچوونی فەیلەسوفو بیریارلندا، ناکرێ ئـەوە فەرامۆش بکرێ، کەلەحاڵـەتێکی پـڕ لـە ئاشـوبو جەنگدا فەیلەسـوفو بیریارێـك مـرۆڤ بەشـەڕەنگێزو خـراپ نـاوزەد بکـا، لەکـەشو هەوایـەکی ئـارامو هێمنیشـدا، بـەجۆرێکی دیکـە. ئـەو متمانەیـەی فەیلەسـوفانی ڕۆشـنگەری بەعـەقڵیان بەخشـیو پێیـانوابوو، بـەهۆی عەقڵـەوە مـرۆڤ سەروەرێتیوەدەست دێنێ. کەواتە گۆڕینی ئاکارو ڕەوشـتی مـرۆڤیش، دەکەوێتـە ئەسـتۆی عەقڵـەوە، ئەگـەر ڕۆسـۆ سروشـتی مرۆڤـی بەچاکە خواز ناوزەد کـردو، هـۆبز بەپێچـەوانەوە، ئـەوا گۆڕینی سروشـتی مـرۆڤ لەحاڵەتێکەوە بۆ حاڵـەتێکی دیکـە، بەڕای فەیلەسوفانی ڕۆشـنگەری لـە ئەستۆی عەقڵدایە. (کانت) بیروڕای خۆی دەربارەی هەریەك لەسروشـتی چـاکە خـوازیو خراپـەخوازی، لـە مرۆڤـدا ئاشـکرا دەکـاو دەربـارەی سروشتی ڕەسەنی خراپە خوازی لە مرۆڤدا، ئاشـکرا دەکـاو دەربـارەی سروشتی رەسەنی خراپەخوازی لەمرۆڤـدا، گوتەیـەکی شـاعیری لاتینـی، هۆراس وەك دروشمێك بەکار دێنـێ کـەدەڵێ: ((مـرۆڤ نییـە بـەبێ خراپـە، لەدایك ببێت))[١٠] . ئەم گوتەیە ئەوەمان پێدەڵێ، کە هەوڵدان بۆ گۆڕینی سروشـتی خراپـە خوازییانـەی مـرۆڤ بـەرەو چـاکێتیو ئاکـاری جـوانو پەسەند، کارێکی ئاسان نییەو ئەم بیرۆکەیە ئەوەمان بۆ ئاشـکرا دەکـا،

کە (کانت) بەرامبەر بە سروشتی چاکەخوازیو گۆرانی مرۆڤ لە خراپییەوە بەرو چاکە، گومان بکا. لەهەمان کاتدا ئەو ئامادەگیەش فەرامۆش ناکا، کەمرۆڤ بۆ گۆران بەرەو چاکە هەیەتی، ئامادەگی گۆران لە خراپەوە بەرەو چاکە، هەر تەنها بەئامادەگی بەرەو گۆڕانو چاکە خوازی نایەتەدی، چونکەوەك چۆن مرۆڤ، ئامادەگیو توانای ئەوەی هەیە کارێکی خراپ بکا، بەهەمان شێوە ئامادەگی ئەوەشی هەیە چاکە خواز بێ. کرداری چاكو خراپ ئەو کاتە دەبنە مایەی پاداشتو سزاو ستایشو سەرزەنشت، کە مرۆڤ لە ئەنجامدانیاندا خاوەنی ئیرادە بیو سەربەست بێ لە جێ بەجێکردنی هەریەکێکیاندا. ئەو کاتە مرۆڤ بەرامبەر بەهەر کردەوەیەك کە ئەنجامی دەدا لێپرسراوە. ئەم حاڵەتە لە کلتوری ئیسلامیدا بووە مایەی لێدوانو ململانێی فکری نێوان تێزو بۆچوونو قوتابخانە جیاجیاکانی نێو مێژووی ئیسلامیو بیرۆکەی جەبر / ئیختیارو جیاکردنەوەی کردەوەو بڕوا لە یەکدی بەرهەمی ئەم بیرو بۆچوونە لێك جیابەبوو.

دیارە لە ئاینی مەسیحیشدا، بیرۆکەی لەم چەشنە هەڵگرانی پەیامی ئەو ئاینەی بەسەر چەندین قوتابخانەو تێزی لێك جیادا دابەش کردووە. ئەگەر بڕوا بە ڕوانینو بۆچوونی ئەو بیریارو فەیلەسوفانە بێنین، کەپێیانوایە مرۆڤ بەسروشت چاکە خواز یان خراپە خوازەو مرۆڤ بەبێ هیچ ئیرادەیەکی خۆی کاری چاك یان خراپ ئەنجام دەدا، ئەو کاتە عەقڵ ڕۆڵو ئەرکی خۆی لە ڕێنوێنی کردنی مرۆڤ بەرەو چاکە یان خراپە لەدەست دەدا، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پاداشتو سزاو ستایشو سەرزەنشت کردن، کە بەرەنجامی کاری چاك یان خراپن، مانای راستەقینەی خۆیان لەدەست بدەن.

هەر کۆمەڵگەیەك خاوەنی جۆرێك لە مۆراڵو ئاكاری تایبەت بە خۆیەتی، کەلە کۆمەڵگەیەکی دیکەی جیادەکاتەوە، بەلام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ، کەمۆراڵو بەهای هاوبەش لەنێوان سەرجەم کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا نییە،لەو ڕوانگەیەوە کەوێکچوونو هاوبەشییەك لە پێکهاتەی نێوان مرۆڤێكو مرۆڤێکی دیکەدا هەیە، مرۆڤ خاوەنی بەهاو مۆراڵی هاوبەشە. کاتێك مۆدێرنە بە پشت بەستن بە عەقڵ هاتو ئەو شێوە مۆراڵە باوەی پێش خۆی ڕەتکردەوە، ئەو ڕاستیەشی فەرامۆش نەکرد، کە کۆمەڵگە پێویستی بە جۆرێك لەبەهاو مۆراڵی دیکە هەیە، بۆ ئەوەی لەبری ئەوانی پێش خۆی بەکاریان بێنێ. یەکێك لە جیاوازییەکانی مۆدێرنەو پۆست مۆدێرنە، ڕوانینی جیای هەریەکێکیان بوو، دەربارەی ئاكار، کە هەر کۆمەڵگەیەك لەژیانیداو بۆ بەرجەستەکردنی پەیوەندی نێوان تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە لەگەڵ خۆیانداو لەگەڵ کۆمەڵگەدا پەیڕەوی دەکا. ئەگەر دەرەنجامەکانی مۆدێرنە، کۆمەڵگەیەکی سەرتاپاگیری یەك ڕەنگو یەك دەنگو کپ کردنی دەنگە جیاوازەکان بوویێ، ئەوا پۆست مۆدێرنە بە پێچەوانەوە، فەیلەسوفانی ئەو قۆناغە بانگەشەی فرە دەنگیو فرە ڕەنگیو خوێندنەوەی جیاوازییەکانیان دەکرد. مەریوانوریا قانیع دەڵێ: (( لێرەوە ئەگەر سوسولۆژیای مۆدێرنە سوسولۆژیای داخراو بێت ئەوا سوسولۆژیای پۆست مۆدێرنە سوسولۆژیای کرانەوەیە. لەیەکەمیاندا بیرۆکەی جەوهەر، وێکچوونو یەکێتی بالا دەستە لە دووهەمدا بیرۆکەی دەرکەوت،جیاوازیونەمانیسێنتەرو ناوەندێکی هاوبەش))[٢] وەك چۆن مۆدێرنە پێناسەیەکی دیکەی پێیە، بۆ دیاردەکانو چەمکەکان سەر لە نوێ بە تێگەیشتنێکی دیکە دادەڕێژێتەوە، پۆست مۆدێرنەش بەهەمان

شێوە پێناسەیەکی دیکەو ڕوانینێکی دیکەی هەیە، کەلە مۆدێرنەی جیادەکاتەوە. چەمکی ئاکاریش لەو چوار چێوەو پێناسەیە دەرناچێ، کەپۆست مۆدێرنە بۆ چەمکو پێدراوو گوتەزاکان دەیکاو مانایەکی دیکەیان پێدەبەخشێ. سیستەمی بەها دەرهاویشتەی ئەزموونی خەڵکو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی هەر گەلو نەتەوەیەکە، کە لەدوایدا لەخەیاڵدانیکۆمەڵگەدا، وەك باسایەکی چەسپاوو باوەڕپێکراو پەیڕەوی لێدەکرێو لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگەدا ڕەنگ دەداتەوە، سارتەر دەڵێ: (( سیستەمی بەهای هەر کۆمەڵگەیەك ڕەنگدانەوەی بونیادی ئەو کۆمەڵگەیەیە)). هەرچەندە ئاکارو بەها، ئەو چەمكو گوتەیەیە کە زیاتر پەیوەندی بە کۆوە هەیە، وەك لە تاك، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە تاك ڕۆڵی نییە لە دەست نیشانکردنو دیاریکردنی جۆرێك لە ئاکارو ڕەتکردنەوەی جۆرێکی دیکە، یان جیاکردنەوەو لێك هەڵاوێردی ئاکاری چاكو خراپو کردەوەی چاكو خراپ. پێغەمبەرانو بیریارانو فەیلەسوفان ڕۆڵیان هەبووە، لەسەرەتاداوەك تاك دەست نیشانی ئاکاری چاكو خراپ بکەنو دوایی ئەو ئاکارانە ڕەهەندی کۆمەڵایەتییان وەرگرتووەو بوونەتە بەشێك لە خەیاڵدانی کۆمەڵگەو لە کۆنەستی کۆمەڵگەدا جێگیربوون. ئاکارو بەها هەروەك (ئەندریە بریدو)لێکی دەداتەوە، لەسەرەتادا. بریارو بۆچوونێکی تاکەکەسییە،کە بەپێی پێویستی بۆ جێبەجێکردنی ئارەزووەکانی ئەو کەسە بریاری لەسەردەدرێو دوایی لەناو کۆمەڵگەدا، دەبێتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیو دەگشتێندرێ[٧]. ئەگەر چی نکۆڵی لەوە ناکرێ، کە کۆمەڵگە ڕۆڵی هەیە لە دیاریکردنوچەسپاندنی ئاکارو بەهادا، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە

کۆمەڵگـە لـەبری عـەقڵو غـەریزەکانی مـرۆڤ قسـەدەکاووەلامگۆی پێداویستیيە عەقڵیو غەریزەييەکانی دەبێ[٧٢].

زۆر جارئـەو ئاکـارو بەهایـەی کۆمەڵگـە بڕیـاری لەسـەر دەداو لـە دارشـتنو فۆرمەلەبوونیـدا بەشـدارە، لەگـەڵ غـەریزەو عـەقڵی مرۆڤـدا ناکۆکـە، هەنـدێ جـاریش بەپێچـەوانەوە، هاوسـەنگیو گونجـان لـە نێوانویستو خواستەکانی مـرۆڤو ئەو بەهایانەدا هەيە، کە کۆمەڵگە پەسـەندی دەکـاو دەيسـەپێنێ. هـەلو مـەرجو بـارودۆخی سیاسـیو ئـابووریو کۆمەلايـەتیو ئـەو ژینگـەو دەوروبـەرەی مرۆڤ تێيـدا دەژی، رۆڵيان هەيە لە دەستنيشانکردنو سەپاندنی جۆرە ئاکارو بەهايەکداو رەتکردنەوەو قبوڵکردنی جۆرە ئاکارو بەهايەکی دیکەدا.

دەشێ لە ژینگەيەکی گوند نشیندا جۆرە ئاکـارو بەهایـەك بالادەست بێوجۆرە ئاکارو بەهايەکی دیکە، کـە لەگـەڵ ئـەو ژینگەو دەوروبـەرەدا نـەگونجێ کەئـەو خەڵکـە تێيـدا دەژی رەت بکرێتـەوە. قبـولکردنو رەتکردنـەوەی هـەرجۆرە ئاکـارو بەهايـەك، پەيوەنـدی بـەو حاڵەتـە سايکۆلۆژییەوە هەيە کە ئەوکەسە تێيدا دەژی.

دەشـێ بڕيـاردانی چـاکیو خراپـی کردەوەيـەك لـە دوو حاڵـەتی سايکۆلۆژی لێك جياداً، دوو بڕياری جياوازو بێ. هەروەها تەمەنو ئاستی گەشەی عەقڵیو رادەی تێگەيشتنی ئەو کەسە لە چەمکی چاکیو خراپی هـەر کـردەوەو هەڵوێسـتێك رۆڵيـان هەيـە، لـە چـۆنێتی ديـاريکردنو دەستنيشانکردنی ئەو بڕيـارەدا. پرۆسـەی پەشـيمان بوونـەوەو داننـانی مرۆڤ بەو تاوانانـەی دەيانکـا، يـان هـەوڵی مـرۆڤ بـۆ چـاکبوونو گـۆڕينی کردەوەو هەڵوێستەکانی لە خراپەوە بۆ چاکە گوزارشـتە لـەو حاڵەتـەی

کە مرۆڤ لە هەموو کاتێکدا ناتوانێ بڕیاری یەکلایی کەرەوەو کۆتایی دەربارەی ئاکارو بەها بدا.

زۆر جار مرۆڤ لە قۆناغێکی تەمەنیدا بڕیارو هەڵوێستێکی دەربارەی ئاکارو بەها هەیەو لە قۆناغێکی دیکەی تەمەنیدا بڕیارو بۆچوونی دەربارەی هەمان ئاکارو بەهایە جیایە. یۆنانیەکان پێیانوابوو لێك نزیکییەك لە نێوان سروشتو مرۆڤدا هەیەو ئەمەشیان کردە بنەمایەك بۆ ئاکار ناسی، چوار ڕەگەزی سەرەکیان لە سروشتدا دیاریکرد کە لە (ئاووگڵو هەواو ئاگر) پێك دێن. (ئەبقرات) قوتابخانەو تێزەکەی لەسەر ئەم بۆچوونە بنیاتنا، کە دیدێکی پزیشکی بوو بۆ لێکدانەوەی مرۆڤو پێکهاتەکانی. بەڕای (ئەبقرات)وەك چۆن ئەم چوار ڕەگەزانە لەسروشتدا تێکەڵیو کارلێکردنی ئەم چوار ڕەگەزانە لە جیهانی ئەستوویی (ماددی)دا شێوازی جۆراو جۆر بە بوون دەبەشێ، مرۆڤیش بەهەمان شێوە بەرەنجامی تێکەڵاوبوونی ئەم چوار ڕەگەزانە، دەبێتە خاوەنی ئاکارو ڕەوشتو خوو خدەی جۆراوجۆر.

سۆفستاییەکانیش بیرو رایەکی دیکەیان هەبوو، ئەوان پێیانوابوو لەم سروشتو گەردوونەداو ناو جیهانی بوونەدا، ڕاستییەکانو ئەو بەهایانەی بەبوون بەخشراون، ڕێژەیینو مرۆڤ بۆخۆی خاوەنی ئەو بەهایانەیەو ئاکاری چاكو خراپو ئاکارو بەهاکانی دیکەش لەلایەن مرۆڤەوە مانایان پێدراوە، بۆیە مرۆڤ پێوانی هەموو شتێکەو ئاکاریش بەردەوام لە گۆڕاندایەو لە حاڵەتێکی جێگیرو نەگۆڕدا نامێنێتەوە. بەڵام هەندێکی دیکە بڕوایان بەوە نەبوو مرۆڤ پێوانە بێ بۆ دیاریکردنو بڕیاردانی ئاکاری چاكو خراپو جوانیو ناشیرینی. (سوقرات) یەکێك بوو لەو فەیلەسوفانەی کە پێیوابوو لەو دیو ئەم ڕێژەگەراییەی

سوفستاییەکانەوە بەهای جیگیرو نەگۆڕ هەیە. ڕزگارکردنی کەسێك لە خنکانو تێرکردنی برسییەك لەهەموو کاتو شوێنێكو هەرکەسێك ئەنجامیان بدا کاری چاکە. سوقرات پێیوایە ئەوانەی چاکەکار نینو خراپە دەکەن، ناتوانن ئاکاری چاكو خراپ لە یەکدی جیابکەنەوە، بۆیە بۆ ئەوەی کەسێك چاکە بکاو لە خراپە دوور بکەوێتەوە، پێویستەپێشتر هەریەك لە چاکەو خراپە بناسێ. بۆیە زانینیش بە بەشێك لە ئاکاری چاك دەژمێررێ. چونکە بەهۆی زانینو شارەزاییەوە مرۆڤ زیاتر نەزانراواکانی بۆ ئاشکرا دەبنو دوای ئاشکرا بوونی ئەو نەزانراوانە، مرۆڤ دەتوانێ دەستنیشانی چاکیو خراپیو جوانی ناشیرینییان بکا. ئەگەر بۆ ئەو بۆچوونەی سوقرات نموونەی کەسێك بێنینەوە کە لە ژوورێکی تاریکدایەو بەهۆی تاریکی ژوورەکەوە، کەلوپەلەکانی نێو ژوورەکە نابینێ، دوای ئەوەی ژوورەکە ڕووناك دەبێتەوە دەزانێ چی لەنێو ژوورەکەدایە. بەڵام بۆ ئاکارە بەرزو بەها چاکەکان کە مرۆڤێکی چاکە خوازی پێ لەمرۆڤێکی خراپ جیادەکرێتەوە، تەنها زانینو ناسین بەس نییە، چونکەپێویستە مرۆڤ دوای ئەوەی ئاکاری چاكو خراپی ناسیو بۆی لەیەکدی جیاکرایەوە، دەبێ هەڵوێستی خۆی لەبەرامبەریاندا دیاری بکاو ئەو کاتە لێپرسراو دەبێ. ئەگەر مرۆڤ بەهۆی نەزانینەوە کارێکی خراپی ئەنجامدا، لەسەرەنجامیئەو کارە بەرپرسیار نابێ. کاتێکیش بڕیاری پەشیمان بوونەوەی داو دڵنی بە تاوانەکەیدانا، ئەوا بەپێی لێبووردەیی ئەو کەسەی کەخراپەکەی بەرامبەرکردووە، دەبەخشرێ یان بەپێچەوانەوە. زانینو تێگەیشتن هۆکارێکن بۆئاشکرابوونو دەرکەوتنی نادیارو ئەوەی بەلای مرۆڤەوە شاراوەیە. زانینو ئاشکرابوون مرۆڤ لەو ڕاراییو گومانە ڕزگار دەکەن، کە بەهۆی نەزانینو

نەشارەزاييەوەرووبەرووى دەبێتەوە. بەلام بۆئەوەى مرۆڤ ببێتەكەسێكى چاكە خوازوواز لەخراپە بێنێ، ناسين بەس نييە، چونكە مەرج نييە هەر خراپەيەكى مرۆڤ دەيكا بەهۆى نەزانينەوە بێ. زۆرجار مرۆڤ دواى ئەوەى چاكەو خراپەشى بۆ لەيەكدى جيادەبێتەوەو دەيانناسێ، بەلام‌واز لەخراپە ناهێنێو چاكە ناكا. بۆيە ناكرێ ئەم بۆچوونەى سوقرات‌وەك چەمكێكى هەمەكىو نەگۆڕ لێى بڕواندرێ‌وگشتگير بكرێ.

(ئەفلاتون) كە فەيلەسوفێكى دواى سوقراتە، پێى‌وايە ئەو گوتەيەى سوفستاييەكان كەدەلێن((مرۆڤ پێوانەى شتەكانە)) بۆ جيهانى بەرهەستو هەميشە گۆڕاو ڕاستە، بەلام‌وێڕاى ئەم جيهانە هەستيار(المحسوس)ە، كەلەحاڵێتيكەوە بۆ حاڵەتێكى ديكە دەگۆڕێو مرۆڤيش بەئەندازەى كاريگەرى ئەم جيهانە لەسەرى، بۆچوونو بڕيارەكانى دەگۆڕێن. مرۆڤو ئەم ژينگەيەى تێيدا دەژى كار لەيەك دەكەنو پەيوەندى مرۆڤيش بەسروشتو ژينگەوە دەگۆڕێ لە حاڵەتێكى نەگۆڕدا نامێنێتەوە. بەلام‌وێڕاى ئەم جيهانە هەستيارە گۆڕاوە، جيهانێكى ديكە هەيە، كەلاى ئەفلاتون جيهانى ئايديا(عالم المثل)ە، كە جێگيرو نەگۆڕە. ئەگەر سەيرى درەخت بكەين، دەبينين چەندان جۆرى درەخت هەيە، قەيسى، سێو. . . هتد ئەمانە درەختن، لەنێوان ئەم درەختانەدا كامە درەختە؟ ئەفلاتون‌وەلامى ئەم پرسيارە بەوە دەداتەوە، كە مەبەست لەدرەخت ئەو درەختەيە، كەلەجيهانى ئەبستراكتو ئايدياداو چەمكێكى عەقڵييەو هەموو ئەو تايبەتمەندىو خەسڵەتانەى تێدايە، كەلە درەختەكانى ديكەدا هەن. درەختى ڕاستەقينە ئەوە نييە كە ئێمە دەيبينين، بەڵكو ئەوەيە كە لەعەقڵو جيهانى ئەبستراكتدا نيشتە جێيە. ئەفلاتون ئەم نمونەيە دەگوازێتەوە

بۆ بوولری ئاکارو پێیوایەوەك چۆن لەسەرووی ئەم درەختانەوە کە دەیانبینین خودی درەخت هەیە، کە لە جیهانی عەقڵ و ئایدیا دایە. ئاکاریش بەهەمان شێوە، تێرکردنی برسییەك، یارمەتیدانی لێقەوماوێك، ئەمانە کرداری چاکن، بەڵام لەودیوی ئەم کردەوە بەرچاوو بینراوانەوە، خودی چاکەو چاکەکاری بەشێوەیەکی ئەبستراکتەو لە جیهانی ئایدیاو عەقڵدا هەیە. ئەفلاتون بڕوای بە دوو جیهان هەیە، یەکێکیان هەستپێکراووبەرجەستە، ئەوی دیکە جیهانی ئایدیاو عەقڵییە. لە ڕوانگەی ئەفلاتونەوە ئێمە ڕۆژانە لەنێوان جیهانێکدا هەڵسوکەوت دەکەین و ئەوەی دەیبینین وێنەیەك یان سێبەرێکی جیهانی ئایدیاو عەقڵە، ئەوەی ئێمەوەك ڕاستی یان چاکی و جوانی دەیبینین، وێنەو سێبەری جیهانێکی سەرووی ئەم جیهانە هەستپێکراوو بینراوەن.

ئەرستۆ فەیلەسوفێکی دیکەی یۆنانییە، کەباسی ئاکاری کردووە، ئەرستۆ پێیوایە کایەی بیرکاری و ئەو زانستانەی کەبە بەڵگە دەسەلمێنرێن((الریاضیات،العلوم البرهانیة)) لەکایەی ئاکار جیایە، چونکە ئاکار بەپێی سروشت و نارەزووی کەسەکان و ئاستی تێگەیشتنیان دەگۆڕێ، بەڵام بەلای ئەرەستۆوە زانستی سیاسی لە هەموو زانستەکانی دیکە زیاتر پەیوەندی بەئاکارەوە هەیە. کاتێك سیاسەت پەیوەندی بەبەڕێوەبردنی دەوڵەتشارەوە هەیەو چۆنێتی ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگە ڕێکبخا، ناکرێ ئاکار ڕۆڵی خۆی تێدا نەبینێ و پەیوەندی پێوە نەبێ. وەك چۆن ئاکار پێناسەی جیاجیا هەڵدەگرێ، سیاسەتیش بەهەمان شێوە چەندین پێناسەی جیاجیای هەیە. لای ئەرەستۆ چاکە لەناوەندی دووخراپە دایە (الفضیلة،سط بین رذیلتین)وەك ئازایەتی، بریتیە لەحاڵەتێك کە دەکەوێتە ناوەندی

سەرکەشیو ترسنۆکییەوە. لەهەمان کاتدا چاکە دژ بەهەر یەك لەو دوو خراپانەیە. کەواتە کاتێك چاکە دەکەوێتە ناوەندی دوو خراپەوە سەر بەهیچ یەکێك لەودووانە نییەو ناکۆکە لەگەڵ هەریەکێکیاندا. ئەگەر بەلای هەریەکێك لەم دووانەدا بچیٔوناوەندەکە بەجێ بێڵێ، پێدەنێتە سنووری خراپەوە، کەبەهۆی زیادەڕەوی(الأفراط) یان کەمڕەوی (التفریط)ەوە دەبێ. ئازایەتی کەدەکەوێتە ناوەندی سەرکەشیو ترسنۆکییەوە کاتێك دەبێتە سەرکەشی،کەزیادەڕەوی تێدا بێو کاتێکیش دەبێتە ترسنۆکی، کەبەلای کەمڕەویدا بێ‌ولەهەردوو حاڵەتەکەدا لەناوەند دوور دەکەوێتەوە. کاتێك ئازایەتی لەناوەند دوور دەکەوێتتەوەو خەسڵەتی سەرکەشیوەردەگرێ، لەخەسڵەتی ئازایەتییەوە نزیکترە، وەك لەوەی لەترسنۆکی نزیك بێتەوە. سەرکەشی زیاتر لەئازایەتییەوە نزیکە، وەك لە ترسنۆکی، ئەم هاوکێشەیە لەهەموو حاڵەتێکداوەك یەك نییەو بەپێی جۆری ئاکارەکە، چ چاك، چ خراپ دەگۆڕێ. ناوەندی نێوان سەرکەشیو ترسنۆکی، کە ئازایەتییە، وەك ناوەندی نێوان بێشەرمیو ناپاکی نییە،لەناوەندی ئەم دووانەدا ئاکاری چاك نییە.

دوای زانینو ناسینی چاکە کارپێکردنی ئەم چاکەیەش بەلای ئەرستۆوە مەرجە، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیەو ئەمەشوای لێدەکا لەناو کۆمەڵگەدا شێوازی ژیانی دیاری بکا، ئەمەش پەیوەندی بە سیاسەتەوە هەیەوسیاسەتیش بەدادگەریەوە گرێ دەداو پێیوایە دەبێ ئەو دادگەریە بۆهەمووان بێ. پرۆسەی سیاسەتیش پرۆسەیەکی عەقڵییە، بۆیە ئەرستۆ ئەو چێژو خۆشییەی کەبەرەنجامی عەقڵ ڕامانە جیادەکاتەوە لەو چێژەی کەمرۆڤ لەخواردنو خواردنەوەدا هەستی پێدەکا، چێژی ئەمانە بەردەوام نییە، بەلام چێژی عەقڵوچالاکییە

عەقڵییەکان بەردەوامەو کاتی نییە، بەلای ئەرستۆوە ئەو خۆشییەی کە مرۆڤ لەچالاکییە عەقڵییەکاندا دەیبینێ لەچێژە جەستەییەکاندا نایبینێ، ئاکاری ئازایەتی بۆئەوەی بچێتە قۆناغی جێ بەجێکردنەوە، دەبێ بابەتێك هەبێ تاکو مرۆڤ ئازایەتیەکەی تێدا بەرجەستەبکا، بەلام چالاکی لۆژیکیو عەقڵی مرۆڤ دەتوانێ بەتەنیا لەگەڵ خۆیدا ئەنجامیان بدا"[٣].

پێناسەو بۆچوونی جیاجیا، دەربارەی ئاکار ئەوە ناگەیەنێ، کە ئاکاروەك سوفستاییەکان بۆی دەچن، مرۆڤ پێوانەی شتەکانەوئەوەی‌وامان لێبکا، گومان لەبوونی ئاکاروەك پێدرلوێکی بابەتی‌وچەمکێکی نەگۆڕ بگەین‌وپێمان‌وابێ لەدەرەوەی سنووری غەریزەو هەست سۆزو عەقڵی مرۆڤ، ئاکارو بەها شوێنگەیەکی نییە. ڕاستە مرۆڤ بەهۆی هەستو سۆزو غەریزەو عەقڵەوە، مانایەك بەچەمكو گوتەزایەکان دەبەخشێو ئەمانیش بەئەندازەی ئەو سنوورو تخوبو تایبەتمەندییەی هەیانە، ئەومانایانە دەبەخشنو گۆڕانی کاتو شوێنو ئاستی تێگەیشتنو ڕادەی هوشیاری مرۆڤ ڕۆڵیان هەیە لە بەخشینی مانای جیاجیا بە چەمكو گوتەزاکان. بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، کە چەمکی بەهاو ئاکار لەخودی خۆیانداو بەدەر لە هەلومەرجو کاتو شوێنگە جیاجیاکان، کەدەبنە هۆی ئەوەی مانای جیاجیایان پێبەخشن، خەسلەتو تایبەتمەندی خۆیان نییەو ناتوانین بەتەنیشت ڕەهەندی گۆڕاوی ئەو چەمكو گوتەزایانەوە، ڕەهەندێکی نەگۆڕیشیان پێبەخشین. دەشێ ئەوەی سوفستاییەکان باسی دەکەن، لەوڕوانگەیەوە بەڕاست بزانین، کەمرۆڤ ئەنجامی ناهوشیاری‌و بێتوانایی‌و لاوازی ئاستی تێگەیشتنی، ببێتە پێوانەی شتەکانو ئەمەش‌وا لەمرۆڤ بکا دوگماییانە بیربکاتەوەو ئەوەی بۆخۆی لەوکاتەدا

بەراستی دەزانێ ڕاستییەکی دیکەقبوڵنەکا. بۆیە ناکرێ ڕوانینی سوفستاییەکان گشتگیربکرێ‌ووەك یاسایەکی نەگۆڕ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ.

ململانێی نێوان ڕێژەگەرایییەکان‌و ڕەها گەرایییەکان، دیاردەیەك نییە لەسەردەمی یۆنانییەکاندا سەری هەڵدابێ‌وبەس، بەڵکو بەردەوام چەمك‌و گوتەزاو پێدراوەکان بەبۆچوون‌و ڕوانینی جۆراوجۆر لێك دراونەتەوە. هەموو کاتێك ڕاستییە ڕەهاو سەلمێنراوەکان لەلایەن ئەوانەی دوگماییانە بیریان کردۆتەوە، بەئاسانی دانیان پێدانەنراوە، یان بەردەوام نکوڵییان لێکراوە، بەپێچەوانەوە، ئەو چەمك‌و گوتەزایانەی ڕەهەندی ڕێژەییان هەیەو لەناهوشیاری مرۆڤەوە، بەرگی ڕەهایی‌و پیرۆزییان بەبەرداکراوە، لەلایەن ئەوانەی داکۆکییان لێکردوون‌و لەلایان پیرۆز بوون بەئاسانی‌وازیان لێنەهێنراوە. مێژووی ئایین، چەندان چیرۆکی ئەو گەل‌و نەتەوانەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کەبتیان پەرستووەو بەئاسانیش‌وازیان لەو بت پەرستییە نەهێناوە. ئەمەش مرۆڤی دووچاری نامۆبوون کردووە، کاتێك مرۆڤ دەستبەرداری سەربەخۆیی‌و تواناکانی خۆی دەبێ‌و خۆی دەداتە دەست بوونەوەرێکی بێگیان‌و دەیپەرستێ، لەکاتێکدا کەدەبێ مرۆڤ باڵا دەست‌و سەروەری ئەو بوونەوەرە بێگیانەبێ. پەیوەندی مرۆڤ بەو بوونەوەرە بێدەسەڵات‌و بێتوانایەوە، دەبوو لەو ڕوانگەیەوە بێ، کەمرۆڤ بۆ پێویستییەکانی ژیانی هەوڵی کەڵکوەرگرتن‌و دەست بەسەرداگرتنی ئەو سروشتەبدا، کە دواتر بەهۆی گەشەکردنی هوشیاری مرۆڤوگەیشتن بە قۆناغێك کە مرۆڤ بەهۆی زیاتر ئاگایی‌و هوشیارییەوە، دەستی بەسەر سروشتدا گرت. کەواتە ناهوشیاری‌و بەدحاڵیبوونی مرۆڤ دەست نیشانی چۆنێتی هەڵس‌و کەوت‌و ڕەفتاری مرۆڤ دەکات‌و بە

پێچەوانەوە هوشیاریو خود ئاگایی مرۆڤیش، والەمرۆڤ دەکا کەجۆرە رەفتارو ئاکارێك بنوێنێ، کەبەرەنجامی ئەو هوشیاریو ئاگاییەتی.

مرۆڤ پەیوەندی بەسروشتو دەورووبەرو تاکەکانی کۆمەڵگەوە هەیە، بەڵام ئەوەی گرنگە چۆنێتی ئەو پەیوەندی کردنەیە، هوشیارییەکی راستەقینە جۆرە پەیوەندییەك لەنێوان مرۆڤو سروشتدا فۆرمەلە دەکا، کە جیایە لەو پەیوەندییەی لەناهوشیارییەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەریك فرۆم دەڵێ: ((مەعریفە لەهەڵوێستیلێکترازانو جیابوونەوەی نێوان خودو بابەتدا بەدەست نایەت، بەڵکولە هەڵوێستیوابەستەبووندا بەدەست دێت )). هەروەك گوتە پێیوابوو: ((مرۆڤ هێندە خۆی دەناسێ، کەجیهانیش دەناسێت))[٣٠]. لەو روانگەیەوە بۆ ئەوەی مرۆڤ سروشتو دەورووبەرو ئەو ژینگەیە بناسێ، پێویستە پەیوەندی بکاو مامەڵەی لەگەڵدا بکا. ئەنجامی ئەو پەیوەندیو مامەڵە کردنە، روانینو تێگەیشتنی جۆرلو جۆر لەبیرو هزری مرۆڤدا فۆرمەلە بووە. هەندێ جار لەسروشت ترساوەو هەندێ جاری دیکەش لەنێوان ترسو خۆشەویستیدا، پەیوەندی نێوان مرۆڤو سروشت بەرجەستەبووە. پەیوەندی مرۆڤ بەسروشتەوە لەحاڵەتێکدا کە تێی نەگەیشتووەو دیاردە سروشتییەکان مایەی سەرنجو رامانی بوون، جیابووە لەو قۆناغەی کە مرۆڤ لەسروشت گەیشتووەو دەستی بەسەردا گرتووە. ئەگەر لەهەندێ حاڵەتدا مرۆڤ لەو روانگەیەوە، کە گۆڕانی هوشیاریو ئاستی تێگەیشتنی، ببێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی چەندین مۆراڵو ئاکاری جیاجیا بەرهەم بێنێو دەستکاری شێوازو رووخساری هەندێك لە بەهاو ئاکارەکان بکا، خاوەنی ئەو سروشتەشە، کەهەندێك ئاکارو بەهای

تایبەتی هەیە، لە دەرەوەی شوێنکات ئامادەیەو بەردەوام لەگەڵیدا دەژی.

لۆژیکی نییە بانگەشەی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری بۆ سەرلەنوێ دارشتنەوەی چەمكو گوتەزاکانو رەتکردنەوەی ئاکارو بەها باوەکانی ئەو سەردەمە، کە هەندێك لەو بۆچوونو ڕوانینانە عەقڵیەتی دوگمای قەشەو پاپاکان بەرهەمیان هێنابوو، پاساوێك بێ بۆ ئەوەی کە ئیدی بەپشت بەستن بەعەقڵ مرۆڤ دەبێتە خاوەنی ئەو ئاکارو رەوشتەبەرزانەی مرۆڤ دەکەنە بوونەوەرێکی چاکەخوازو مرۆڤ لەدەرەوەی عەقڵو تواناکانی خۆی، پێویستی بە بەهاو ئاکارێکی دیکە نییە. ئایینەکانیش بۆ ئەوە نەهاتوون سەر لەنوێ مرۆڤ دروست بکەنەوە. مرۆڤ پێش ئاینو ڕۆشنگەریوەرچەرخانەکانی دیکە، بوونەوەرێکی دروستکراو بووەو پێویستی بە سەر لەنوێ دروستکردنەوە نییە، بەڵکو پێویستی بەوەیە ڕوانینەکانیدەستکاری بکاو خۆی لەو دوگماییانە ڕزگار بکا، کەبەرەنجامی بێتواناییو ناهوشیاری خۆیەتی. ڕاستەمرۆڤ خوازیاری گۆڕانکاریو بەخشینی مانای نوێیە بەچەمكو گوتەزاکانو مشتو مڕو لێدوانو گفتوگۆی نێوان بیریارو فەیلەسوفان بیرو هزری مرۆڤیان بەچەندین ماناو لێکدانەوەی جیاجیا دەربارەی ژیانو بوون ئاشناکردووە. وەك چۆن بیریاروفەیلەسوفان بۆخۆیان لەوململانێی فکریو فەلسەفییەی نێوانیان، چالاکی زیاتریان بەبیروهزری خۆیان داوە، خەڵكو

کۆمەڵگەشیان ڕووبەڕوی پرسیاروو‌ەڵامی جۆراوجۆر کردۆتەوەوئاسۆی بیرو هزری خەڵکیان فرلوانتر کردووە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە مێژوو بەردەوام مرۆڤی بەشێوەیەك گۆڕیوە، کەمرۆڤی

دوێنێ بەتەواوی بەجێ هێڵراوەودەستکاری کردن‌و تێپەڕاندنی ماناو گوتەباوەکان بەو مەبەستە نییە کەسەرجەم مۆراڵ‌وپێدراوی نوێ مژدە بەخش‌و مایەی ئاسوودەییەو ئەوەی تراسیۆن‌وباوە، هەمووی مایەی نەهامەتی‌و بەشمەینەتییەو دەبێ مرۆڤ دەستبەرداری سەرلەبەریان بێ. زاناو بیرمەندانی ئیسلامی بەکاریگەری فکری یۆنانی بەچەندین ڕوانین‌و بۆچوونی جیاجیا لەئاکاریان ڕوانیوە. هەریەك لەکندی‌و رازی‌وفارابی. . . هتد، قسەیان لەسەر ئاکار کردووە. کندی بەئامادەبوونی جالینوس لە ئاکار دەدوێ، کندی پێی‌وایە، نابێ مرۆڤ بۆ لەدەستدانی ئەوانەی پەیوەندییان بەلایەنی هەستی (الحسی)ییەوە هەیە غەمبارببێ، چونکە ئارەزووەهەستیەکان بەردەوام نابن‌و نێمەش، بەپێچەوانەی ئەو سروشتەی هەیانە دەمانەوێ بەردەوام بن، ئەمەش دووچاری خەفەتمان دەکا، بۆیە پێویستە گرنگی بەچالاکیە عەقڵیەکانمان بدەین، کەئەوان خەسڵەتی بەردەوامییان هەیەو لەدەستمان دەرناچن‌و دەتوانین بەردەوام لەگەڵیاندا بین. ڕازی لەبەرئەوەی کە پزیشك بووە، مامەڵەکردنی لەگەڵ جەستە، چ لەشساغی‌و چ نەخۆشی جەستەوای لێکردووە کەبەهەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ ئاکاریشدا بکاودەروونی مرۆڤی‌وەك جەستە تەماشاکردووە، وەك چۆن لەش نەخۆش دەبێ‌و چاك دەبێتەوە، دەروونی مرۆڤیش بەهەمان شێوە نەخۆش دەبێ‌و چاکیش دەبێتەوە.

بەلای ڕازییەوە، سەرچاوەی ئاکاری جوان عەقڵەو مرۆڤ بەهۆی عەقڵەوە دەتوانێ زاڵبێ بەسەر ڕەوشتە نزم‌و ناپەسندەکاندا، کەسەرچاوەیان هەوەس‌و ئارەزووی بەدە، کەمرۆڤوالێدەکەن دوای ئەو ئارەزووە خراپانە بکەوێ. کاتێك ڕازی زاڵبوون بەسەر جەستەدا،

بەهۆکارێك دەزانێ بۆ ئازادی عەقڵو ئاسودەیی گیانیی، مەبەستی لەوەنیە ڕێگەیەکی سۆفیگەرا بگرێو جەستە ڕەتبکاتەوە، بەڵکو پێیوایە بەهۆی عەقڵو فەلسەفەوە مرۆڤ دەتوانێ زاڵبێ بەسەر ئەو ئارەزووە جەستەییانەدا، کەمرۆڤ بەرەو خراپەکاری دەبەن. هەروەها رازی بەکەڵکوەرگرتن لەئەفلاتون بنەمای چێژ دیاری دەکا. کاتێك باسی چێژ دەکرێ، دەبێ باسی ئازاریش بکرێ، چونکە چەشتن حاڵەتێکە مرۆڤ لەو ئازارە ڕزگاری دەکا، کەبەبێ ئەو چەشتنە هەستی پێدەکا. مرۆڤ لەکاتی چەشتندا دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی پێش ئازار چەشتن. ڕازی، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەمە، کەسێك بەنموونە دێنێتەوە، کەلەژێر سێبەرێکدا بووەو دوایی چووەتە بەر هەتاوو گەرمای بووە، کاتێك دێتەوە بەر سێبەرەکە ئائەو کاتە هەستکردن بەچێژوو چەشتن بەردەوام دەبێ تا دەگاتەوە حاڵەتی یەکەم جاری، کەلەبەر سێبەرەکەبووە. لێرەدا دەردەکەوێ کەبۆ تێگەیشتن لە ئاکارو ڕەفتاری مرۆڤ، تێگەیشتن لەجەستەی مرۆڤ پێویستە. ئەگەر لەشساغیو تەندروستی مرۆڤ ئەوە بێ جەستەی مرۆڤ نەخۆش نەبێو ئازاری نەبێ، ئەوا دەروونو ئاکاری مرۆڤیش بەهەمان شێوە، دووچاری نەخۆشیو چاکبوونەوە دەبێ،وەك چۆن نەخۆشی جەستە پێویستی بە چارەسەرە، ئەوا لایەنی دەروونی مرۆڤیش لەکاتی نەخۆشیدا پێویستی بەچارەسەر هەیە. ڕقو کینەو ئیرەییو خەمو خەفەتو چەندان نەخۆشی دیکە، کەپەیوەندییان بەلایەنی دەروونیوئاکارەوە هەیەڕێگا چارەی جۆراجۆریش هەیە بۆ چارەسەریان. لەبەرامبەر ئەم ئاکارانەدا کەبەنەخۆشی ئاوزەدمان کردن ئاکاری چاکیش هەیە، کە لەدڵنەرمیولێبوردەییوبەزەییدا بەرجەستە دەبن[٣٣].

ئەگەر نەخۆشی جەستە، تێکچوونی هاوسەنگی مرۆڤ بێو لەشساغی گەڕانەوەی ئەو هاوسەنگییە بێ، ئەوا نەخۆشی دەروونیش وەك نەخۆشی جەستە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی هاوسەنگیو مرۆڤ لەو لادانە ڕزگاری بێ. دیارە چارەسەرکردنی نەخۆشی جەستە بەو دەرمانانە دەبێ کە بۆ چاکبوونەوەی جەستە تاقیکراونەتەوەو دەبنە هۆی چاکبوونەوەی لەش. دەروونی مرۆڤیش پێویستی بەوە هەیە لەڕێگەی جۆراو جۆرەوە چاك ببێو لەئاکاری بەدو ناپەسند بگۆڕێ بۆ ئاکاری چاك. ئەمەش وەك جەستە نییەو پێویستی بەمیکانیزمی تایبەتی هەیە، ئەگەر ئامۆژگاریکردن یەکێك بێ لەومیکانیزمانە، ئەوا دەشێ هەندێ جار ئامۆژگاریش ئەو ڕۆڵە نەبینێو ئەو کەسە دووچاری جۆرێك لەڕا لەخۆبوونو نکوڵی کردن بێ. کردەی ئاکار کردەیەکی ناوەکییەو دەبێ ئەو کەسە لەناخی خۆیدا گۆڕانکاری بەرپا بکا. ئەگەر مرۆڤی توشبوو بەنەخۆشی جەستەیی خوازیاری چاکبوونەوە بێ، ئەوا کەسانی نەخۆش بەئاکارە خراپەکان زۆر جار، نەك هەر هەوڵی گۆڕانکاری نادەن، بەڵکو دەیانەوێ لەسەر ئاکارەکانیان بەردەوام بن. ئەگەر نەخۆشی جەستەییو دەروونی لەڕواڵەتدا جۆرە لێکچوونێکیان لەنێواندا هەبێ، ئەوا لەناوەڕۆکدا جیان. فارابیش لەشارەکەیدا باسی ئاکاری کردووەو لەئاکاری چاكو خراپ دواوەوجیاکاری کردووە لەنێوان ئەو چێژانەی سەرچاوەکەیان جەستەیەو ئەوانەی سەرچاوەکەیان عەقڵە. فارابی پێیوایە مرۆڤ بەسروشت خاوەنی هێزو ئامادەگییە بۆ جیاکردنەوەی چاکەو خراپە لەیەکدی. سروشتو توانای خەڵکوەك یەك نییە. هەندێك لەڕووی فکرو عەقڵەوە بەهێزنو دەتوانرێ بۆ بەڕێوەبردنی شار کەڵکیان لێوەربگیرێ وهەندێکی دیکەلەپیشەدا شارەزان وبەهۆی شارەزاییان لەو

پیشانەدا ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکەن. بۆیە پێویستە هەرکەسە بەپێی تواناو شارەزایی ئەو بوارەی خۆی کەڵکی لێوەربگیرێ تاکو شارلەهەموو ڕوویەکەوە بەشە جیاجیاکانی بەیەکەوە گرێبدرێن. فارابی چەمکی ناوەندواتا، نە زیادەڕەویکردن‌ونە کەمڕەویکردن لەئاکاردا، کە چەمکێکی ئەرستۆیە بەگرنگ دەزانێ‌و پێی چاکە پەیڕەوی لێبکرێ. هەروەها پێی‌وایە ئەمەش بەهۆی بەکارهێنان‌و پراوە لەسەر کردن مرۆڤ دەتوانێ بیکاتە ئاکارێکی بەردەوام لەخۆیداو لەسەری ڕابێ.

فارابی لەنێوان ئەفلاتون‌و ئەرستۆدا ڕوانین‌و بۆچوونەکانی دەربارەی ئاکارو چۆنێتی بەڕێوەبردنی شارو پەیوەندی نێوان تاکەکانی دەردەبڕێ. ئەگەر ئەرستۆ ڕوانگەی بۆچوونەکانی یۆنانییەو پێی‌وایە، خەڵکی یۆنان لەچەند چین‌و توێژێك پێك هاتوون‌و هەندێکیان کۆیلەن‌و کۆیلەش بەحاڵەتێکی سروشتی دەزانێ، ئەوا فارابی بەکاریگەری بیرۆکەی کسرەویەتی ئێرانی، بیرۆکەی پاشایەتی بەرجەستە دەکاو پێی‌وایە سروشتیە کە هەندێ کەس دەبێ پاشا بن‌و داوا لە خەڵکیش دەکا ملکەچی بن، چونکەوەك چۆن لای ئەرستۆ کۆیلایەتی سروشتییە، ئەوا لای فارابی پاشایەتی سروشتییە. کاتێك فارابی لەشارەکەیدا بەراووردی نێوان ئەو سیستەمە دەکا کە لەگەردووندا هەیەو ئەمەش بەسەر شارەکەیدا پیادە دەکا. لەم بیرۆکەیەدا لە ئەفلاتون نزیك دەبێتەوەو لەئەرستۆ دوور دەکەوێتەوە[٧٦].

## عەقڵ لەنێوان کرانەوەو داخراندا

ئەگەر دان بەڕوانینو بۆچوونی، ئەوبیرمەندوفەیلەسوفانەدا بنێین، کەعەقڵوەك پێدراوێکی سروشتیوزگماکی پێناسەدەکەن، ئەوا متمانەبەئەگەری گۆڕانی عەقڵی داخراوودوگما، بەرەو کرانەوەو گۆڕان کەم دەبێتەوە. بەپێچەوانەشەوە، هەندێك لە بیریاروفەیلەسوف لەوباوەڕەدان کەئەگەری گۆڕانی عەقڵ بەگشتیوعەقڵی دوگما بەتایبەتی لەحاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دیکە، چاوەڕوانکراوە.

گۆڕانی هەلومەرجو بارودۆخی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتی، ڕۆڵی دیاروئاشکرای هەیە، لەگۆڕانی عەقڵی هەرگەلونەتەوەوتاکێکی ئەوگەلو نەتەوەیە، لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دیکە. خوێندنەوەی عەقڵیەتی هەرگەلونەتەوەیەك لە کاتێکەوە بۆ کاتێكو لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێ. پەیوەندی مرۆڤ بە سروشتو ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژی چۆنێتی عەقڵو بیرکردنەوە مرۆڤ دیاری دەکا.

عەقڵی یۆنانی لەڕوانگەی ئەزموونەوە پەیوەندی بە سروشتەوە کردووەو ڕووداوو دیاردەکانی سروشت، لەلای یۆنانیەکان لەڕوانگەی ئەو هۆکارانەوە لێکدراونەتەوە کەبەرەنجامی چەند ئەزموونوتاقیکردنەوەیەکی دیاریکراوبوون، بەلام عەقڵی عەرەبی وەك جابری باسی دەکا ڕەهەندی هەستو سۆز ڕۆڵی دیوە لەم پەیوەندیەدا[٣٧]. ئەگەر عەقڵی عەرەبی لەخودەوە بەرەو بابەت جوڵەی کردبێ، ئەوا عەقڵی یۆنانیو لەدواییدا ئەوروپی سەرەتا لە لەبابەتیان کۆڵیوەتەوە. عەقڵو ڕوانینی تاکەکانی کۆمەڵگە چەندە بەرەنجامی بیرکردنەوەو ڕامانی ناوەکیو خودی ئەوتاکانەیە، ئەوەندەش بەرەنجامی ئەو بەریەککەوتنو مامەڵەیەکەئەو تاکانە لەگەڵ ژینگەو

ئـەو کۆمەڵگەیـەی تێیـدا دەژیـن لەلایـەن فۆرمەڵـە دەبـێ. ئـەو بـەر یەککەوتن‌و پەیوەندییەی نێوان تاك‌و ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژی، دەشێ لە لایەك عـەقڵێکی داخرلو بەرهـەم بێنـێ‌و لەلایەکی دیکـەوە عـەقڵێکی کـراوە. عـەقڵی داخـراو نایـەوێ لەوچوارچـێوەو سـنووره دەرچـێ کەبەرەنجامی پەیوەندی نێوان تـاك‌و سروشـت‌و ژینگـە فۆرمەلـە بـووەو نایـەوێ عـەقڵی بـاو تێپـەڕێنێ‌و بەچـەندین پاسـاوی جۆراوجـۆرەوە، پارێزگاری لەوڕوانین‌و بۆچوونانە دەکا، کەلەسەردەم‌و قۆناغی جیاجیادا نەوەکان یەك لەدوای یـەك پاراستوویانە. یـەکێك لـەو هۆکارانـەی‌وادەکا کەعەقڵی هەر کۆمەڵگەیـەك داخـراوی بمێنێتـەوە ترسـان‌و سـڵکردنەوەی هـەڵگرانی پـەیامی چاکسـازی‌و گۆڕانـە، بۆیـە (کانـت) ی فەیلەسـوفی ڕۆشـنگەری جـەختی لەسـەر ئـەوەدەکردەوە کـەمرۆڤ دەبـێ بوێرانـەو سەربەخۆییانە عـەقڵی خـۆی بەکاربێنێ[٢٨]. کێشـەی هـەڵگرانی پـەیامی خـودایی لەگـەڵ کۆمەڵگەکانیانـدا ئـەوە بـووە، خـەڵك بەئاسـانی دەستبەرداری داب‌و نەریت‌و بۆچوون‌و ڕوانینی باوك‌و باپیرانیان نەبوون. چ هـەڵگرانی پـەیامی خـودایی‌و چ فەیلەسـوف‌و بیریـاران بەبەرامبـەر ڕوانین‌و بۆچوونێك کـە پێچەوانەی ڕوانین‌و بۆچـوونی کۆمەڵگـە بـووە، ڕووبـەڕووی کێشـەو گرفـت بوونـەوەو بەچـەندین شـێوازی جۆراوجۆردژایەتییان کـراوە. مـرۆڤوەك چـۆن بۆپاراسـتنی بـوونی خـۆی لـەڕووی جەسـتەییەوە بەرپـەرچی هـەر هێـرش‌و پـەلامارێك دەداتـەوە کەبکرێتە سـەری، بۆ پاراسـتنی عەقڵ‌وبۆچـوونە عـەقڵی‌و فکریەکانیشـی ئەو بەرگرییە دەکا. ئەو باوەڕو بۆچوونانەی مرۆڤ دەربارەی ژیان‌و بوون لـەلای فۆرمەلـە دەبـن، تێکـەڵ بەهەسـت‌و نەسـت‌و هۆشـیاری دەبـن‌و بەسـۆزو خۆشەویسـتییەوە گوزارشـتیان لێدەکـا. ئـەم سـۆزو

خۆشەویستییەی مرۆڤ بۆ ئەو ڕوانین و بۆچوون و داب و نەریتانەی پێشینانی دەبێتە هۆی ئەوەی دووچاری چەقبەستن و دۆگمایی بیبۆ بەئاسانی دەستبەردار یان نەبێ. ئەرکی هەڵگرانی پەیامی چاکسازی بیریارو فەیلەسوفان دەبێ بوێرانە بۆ بەمتمانە بەخۆبوونەوە دەستکاری ئەو چەمک و گوتەزایانە بکەن، کە بەپاساوی جۆراو جۆرەوە بەبێ دەستکاری کردن و قسەلەسەرکردنیان لە هوشیاری تاکەکانی کۆمەڵگەدا ماونەتەوە. دەستکاری کردن و هەوڵدان بۆ بەخشینی مانایەکی جیا لەوانەی دیکە بەهەر چەمک و گوتەزایەک، مانای ڕەتکردنەوەو قبوڵنەکردنی ئەو گوتراوانە نییە. دەستکاری کردن بەهەر ئامانجێک بێ چالاکییەکی عەقڵییەوعەقڵ لەوچوارچێوەیە دەرنێنێ کەبواری جوڵەی نادا. هەندێ جار گەڕانەوە بۆ فکروبیدی سەدەکانی پێشترو جارێکی دیکە خوێندنەوەو ڕاڤەکردنیان، جۆرێکە لە گۆڕانکاری و چالاکی عەقڵی ووزەبەخشینە بەتواناعەقڵی وفکرییەکانی مرۆڤ. (لیوتارد)دەڵێ: ((پۆست مۆدێرنەبریتی نییە لەمۆدێرنەیەک لەدواهەمین قۆناغەکانی ژیانیدا، بەڵکو بریتییە لەمۆدێرنەیەک لەبێشکەدایەو هەرگیز لەوبێشکەیەش نایەتە دەرەوە))[39]

عەقڵی داخراو نایەوێ لەو چوارچێوەیەی بۆخۆی بڕوای پێیەتی بێتەدەری بۆ لە هەمان کاتدا بڕوای بەبۆچوون و ڕوانینەکانی دەرەوەی عەقڵی خۆشی نییە، بۆیە چەندەعەقڵی خۆی ناخاتە ژێر پرسیارەوەو بەگومانەوە مامەڵەی لەگەڵدا ناکا، بەهەمان شێوە لەگەڵ ئەوی دیکەدا بەگومانەو نایەوێ مامەڵەی لەگەڵدا بکاو هەندێ جار نەک هەر عەقڵی بەرامبەر ڕەتدەکاتەوە، بەڵکوئامادە نییە گوێشی لێبگرێ. ئەمەش پێچەوانەی عەقڵی کراوەیە کە بەردەوام دەیەوێ لە دایەلۆگ و گفتوگۆ

دابێو نەك هەر ئامادەیە گوێ لەئەوی دیکە بگرێو گفتوگۆی لەگەڵدا بکا، بەڵکو ڕوانینو بۆچوونەکانیشی قبوڵدەکا. عەقڵ لە ئەنجامی کرانەوەو چالاکبوونیدا، زیاتر سروشتو دەوروبەر دەناسێو چەمكوواتای دیکە بەدیاردەو بینراوەکانی نێو ژیانو بوون دەبەخشێو بەپێچەوانەوە کاتێك عەقڵ دەرگا لە ڕووی بەرامبەر دادەخا، لەچوارچێوەی ئەو گوتەزاو زانینانەدا دەمێنێتەوە کە پێشتر بەرهەم هاتوون.

عەقڵیەتی کراوەو داخراو، تایبەت نییە بەتیۆرو فکرو باوەڕێك، ئەوەی کە کەسێکی خاوەن عەقڵیەتی دوگما لەکەسێکی خاوەن عەقڵیەتێکی کراوە جیادەکاتەوە، دوو ڕوانینو فکرو فەلسەفەی لێك جیای ئەو دوو کەسە نییە، بەڵکو لەنێو یەك جۆر فکرو ڕوانینوئاییندا، عەقڵیەتی داخراووکراوە هەیە. ئەگەر دوو فکرو ڕوانینو ئایینی لێك جیا داخراوانە مامەڵە لەگەڵ یەکدیدا بکەنو ئەمیان ئامادەنەبێ ئەوی دیکە بخوێنێتەوە، ئەوا لەنێو لایەنگرانی یەك جۆر ئایینو فکرو فەلسەفەدا عەقڵی داخراووکراوە هەیە. ئابێوابزانین کەکەسێك هەڵگری فکروئایدۆلۆژییەك بێو بانگەشە بۆ جۆرە فەلسەفەو ڕوانینێك بکا، ئەوا لەژیانی ڕۆژانەو کردەیی ئەوکەسەدا، ئەو ڕوانینو فکرە بەرجەستە دەبێ، دەشێ زۆر جار بەپێچەوانەی فکرو ڕوانینەکەیەوە ڕەفتار بکا. ئاستی ڕۆشنبیریو ڕادەی هوشیاریو حاڵەتی سایکۆلۆژیو بارودۆخی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتی لێك جیا، وێنەی جیا بەفکرو ڕوانینەکان دەبەخشێ. عەلی حەرب دەڵێ:((فکر بەرهەمی ئەزموونی ڕاستەقینەمانە، نەك لەبەرزاییەوە دابەزێ بۆ لامان)) [18]. چۆنیتی مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ ئەو فکرو ئایدۆلۆژییەی بانگەشەی بۆ دەکا، ئەو فکرو ڕوانینو

ئایدۆلۆژییە بەرەو داخران یان کرانەوە دەبا. چۆنێتی مامەڵەکردن و ئەزموونەکانی ژیان فکرێکیوەك فکری مارکسی بەرەو داخران یان کرانەوە دەبا، ئەمە بۆ فکرەکانی دیکەو فکری ئایینیش ڕاستە، بۆیە ڕاست نییە فکرێك بەشێوەیەکی گشتیو سەرتاپا گیر بەداخراو یان کرانەوە ناوزەد بکرێ. دەشێ هەندێك فکرو ڕوانینو فەیلەسوفانیش لەبنەڕەتداو لەخودی خۆیاندا هەڵگری دیدێکی داخراو یان کرانەوەبن. کاتێك عەقڵو فکرێك دووچاری نەرجسیەتو بڕوا بەخۆبوونێکی کوێرانەو بێبنەما دەبێ، ناتوانرێ بەئاسانی ئەو دەرگاو دەلاقانەی بەڕوودا بکرێنەوە کە بەپاساوی جۆراوجۆرەوە نایەوێ بیانکاتەوە. عەقڵیەتی کراوە بەپێچەوانەی داخراو، دەرگاوپەنجەرەکان داناخاو گوێ لەفکرو بۆچوونی بەرامبەر دەگرێ، چونکە لەوە گەیشتووە کەبەگوێگرتن لەبەرامبەرو ئامادەگی بۆ گفتوگۆو بەیەکەوە دانیشتنو ڕاگۆڕینەوە، نەك زیان بەفکرو بۆچوونەکانی خۆی ناگەیەنێ، بەڵکو دەبێتە هۆی گەشەو چالاکی زیاتری ئەو عەقڵیەتو فکرەی بانگەشەی بۆ دەکاو لەئاستێکەوە دەگەیەنێتە ئاستێکی دیکە.

زۆرجار عەقڵی داخراو ئەنجامی گرێی خۆبەکەمزانین، دەرگا دادەخاو ئامادەی ئاڵوگۆڕیفکریومەعریفی نابێو ئەوەی دیکە بەزیاترو گەورەتر دەزانێ لەخۆیو پێیوایە ئەو جوانو ئەم ناشیرینەو ئەو زاناو ئەم نەزانە. . . . بەپێچەوانەشەوە هەندێ جار تووشی گرێی خۆبەزلزانین دەبێو خۆی لەبەرامبەر بەزاناترو بەتوانا ترو بەجوانتر دەزانێ، بەبێ ئەوەی ڕەخنە ئاراستەی خۆی بکاو ناتەواوییەکانی خۆی ببینێ، بەدوای ناتەواوییەکانی ئەوی دیکەدا دەگەڕێ، بەڵام عەقڵیەتێك کە دەیەوێ زیاتر لەجیهانو بوون بگاو نادیارەکانی بۆ ئاشکرابنوبەدوایوەڵامی

پرسیارەکاندا دەگەڕێ، بەلایەوە ئاساییە لەدەرگاکان بداو پەنجەرەکان بکاتەوەو پرسیاریکاو بەدوای وەلأمدا بگەڕێ.

کاتێـــک عـــەقڵی داخـــراو لـــە ژوورە بچـــکۆلەکەی خۆیـــدا دادەنیشـێو پەنجەرەو دەلاقەکان دادەخـا، ئەمـە بـەو مانایـە نییـە کـە ئیدیواز لەوی دیکە دێنێو قایلە بـەو ڕەخنـەو تێبینییانـەی لەبەرامبـەر ئەم داخراوی و دووره پەرێزییەی ئاراستەی دەکرێ. بەڵکو ڕەخنە لـەوی دیکە دەگرێو تۆمەتی نابەجێی دەداتە پاڵو چاوەڕوانی ئەوەی ئـەوەی لێدەکـا، ئـەویش وەك ئـەم پەنجـەرەکان دابخـاو لەژوورەکـەی خـۆی دانیشێ. ئەوەی زیاتر عەقڵی داخراو بەرەوە داخـراوی دەباو لەئەگـەری گۆڕان دووری دەخاتەوە، ڕوانینی تاکرەهەندانـەو پێداگرتنیـەتی لەسـەر بـەکارهێنانی یـەك میکـانیزمو ڕوانگـە کـە بەهۆیـەوە خـۆیو دەورووبـەرو ئەوی دیکەی پێ پێناسە دەکاو یەك چاوی هەیە بۆ بینینی جیهانو یەك ڕاڤەو یەك خوێندنەوەی هەیە بۆ چەمكو گوتـەزاو دیاردەکـانو پێیوایـە ئەو ڕاڤەو خوێندنەوانە بەسن بۆ ناسینی ژیانو بوونو جگەلـە مانـا بـاوو ئەوەی دیارو بینراوە، ماناو گوتراوو نادیارێکی دیکە نییە بۆ لێکدانـەوەو ڕاڤەی ژیانو بوون.

بۆ ئەوەی عـەقڵی داخـراو خـۆی لـەو ژوورە بچوكو گۆشـەگیربوونەی تێیـدا دەژی ڕزگـار بکـا، پێویسـتی بەکردنـەوەی دەرگـاو قبـوڵکردنی گفتوگـۆو بـیرورا گۆڕینەوەیـە لەگـەڵ ئـەوی دیکـەدا. پێویسـتی بـە بـەکارهێنانی زیـاتریوزەو تواناکانیـەتی تاچیدیکەلەگۆشـەگیریو دووره پەرێزیدا نەژی. پێویستە زیـاتر چـالاکییەعەقڵییەکانی گەشـە پێبـداو لـە ئاسۆو دەلاقەو ڕوانگەیەکی دیکەوە بۆ ژیانو دەورووبەربڕوانێ.

پێویستە عەقڵییەتی کراوەش، ڕا لەخۆبوون و متمانەیەکی بێبنەماو کوێرانەوای لێنەکا خۆی لە سەرووی ڕەخنەو تێبینییەوە ببینێ و لەدواییدا ئەمەش بەرەو ئەگەری داخرانی بەرێ. چونکە وەک چۆن لەعەقڵی داخراودا ئەگەری کرانەوەو گۆڕان هەیە، بەهەمان شێوە دەبێ عەقڵی کراوەش پێشبینی ئەو ئەگەرە بکا، کە ڕوولە داخران و گۆشەگیری بکا، بۆیە بەردەوام پێویستی بەسەر لەنوێ خۆ نوێکردنەوەو بەرچاو ڕوونی هەیە.

# پەراوێزەکان

١. الاسلام بين الشرق،الغرب علي عزت بيكوفيج ص ٦٣

٢. كانت ملامح عن حياته،اعماله الفكرية. تاليف. د. عماد عبدالسلام رؤوف ص ١٩.

٣. فلاسفة اوروبيون. من ديكارت الى برگسون. الدكتور موسى الموسوى.

٤. هەمان سەرچاوە ص ١٧ –١٨.

٥. محمد عابد الجابرى. نحن،التراث. دار الطليعة. بيروت.

٦. قەیرانی فیکری هاوچەرخ. د. طه جابر العلوانى. وەرگێرانی. ئیبراهیم مەلازادە.

٧. نحن،التراث. الدكتور محمد عابد الجابرى ص ٢٨٧.

٨. هەمان سەرچاوە ص ١١١.

٩. فردريك نيتشه. عوسمان ياسين لا ١١٥.

١٠. گۆڤاری ڕەهەند. ژمارە (٩ – ١٠) ی ٢٠٠٠ لا ٢٠٢.

١١. فريدريك نيتشه. عوسمان ياسين لا ٥٢.

١٢. گۆڤاری هەزان. ژمارە (٦) دەسەلاتو سیسنەم نووسینی. هێمن قەرەداغی لا ١٩.

١٣. ابن رشد، سيرة،فكر. الدكتور محمد عابد الجابرى. مركز دراسات الوحدة العربية ص ١٥٤.

١٤. المسألة الثقافية في الوطن العربي. الدكتور محمد عابد الجابرى. مركز دراسات الوحدة العربية ص ٦٣ – ٦٤.

١٥. المسألة الثقافية في الوطن العربي. محمد عابد الجابرى. مركز دراسات الوحدة العربية ص ٦٣ – ٦٧.

١٦. پۆشنگەری: تێزێکی ئایدۆلۆژی یان تێزێکی رەخنەگرانە. رێبین هەردی. گۆڤاری رەهەند ژمارە (١١)ساڵی (٢٠٠٠).

١٧. محاضرات جديدة في التحليل النفسي: سيجموند فرويد. ترجمة: جورج طرابيشي. ص ٢١٦.

١٨. گۆڤاری رەهەند. ژمارە ١١ ساڵی ٢٠٠٠ لا ٦٧.

١٩. گۆڤاری پۆشنگەری. ژمارە (١١ – ١٢) لا ١٠٢.

٢٠. مغامرة المنطق البنيوي. ابراهيم محمود ص ٢٢٣ – ٢٢٠ الجزء الاول. البنيوية كما هي !

٢١. استراتيجية التسمية. مطاع صفدي ص ٢١١. في نظام الانظمة المعرفية.

٢٢. لە نێوان مودێرنەو ئیسلامی سیاسی دا. مەریوانوریا قانیع گۆڤاری رەهەند. ژ. ١١ لا ٢٩.

٢٣. محمد اركون. اسلام. اوروبا. الغرب. ترجمةءاسهام. هاشم صالح ص ٢٥

٢٤. گۆڤاری رەهەند. ژمارە ٩ – ١٠ / ٢٠٠٠ مۆدێرنێتی: لەخەونی گۆرانەوە بۆ خەونی مردن. رێبین هەردی لا ١٨.

٢٥. کاریگەری کەلتوری ئەوان لەسەرکورد. عەتا قەرەداغی لا ١١٥.

٢٦. هەمان سەرچاوەو لاپەرە.

٢٧. محمد اركون. اسلام. اوروبا. الغرب. ترجمةءاسهام هاشم صالح ص ١٩–٢٥.

٢٨. پۆشنگەری سەردەمی عەقلانیەت. نووسینی: حینحلی نوزیوەرگێرانی: سەلام مارف. گۆڤاری پۆشنگەری ژمارە ١١ – ١٢ لا ١٣٨ – ١٣٩.

٢٩. فلسفة هيجل. العقل في التاريخ. ترجمةتقديمتعليق. د. امام عبدالفتاح امام. دار التنوير. بيروت. ١٩٨٣ ص٤٩.

٣٠. فلسفة هيجل / فلسفة الروح. ءالترستيس. بيروت. لبنان ص ٥٤.

٣١. هەمان سەرچاوە ص ٥٥.

٣٢. هەمان سەرچاوە ص ٦٣.

٣٣. گۆڤاری ژیار. ژمارە (٨) لا ٢٤ ساڵی ٢٠٠١.

٣٤. محمد اركون. نافذة على الاسلام. ترجمة صباح الجهيم. ص ١٢٥ الطبعة الثانية. ١٩٩٧ دار عطية.

٣٥. المسألة الثقافية في الوطن العربي. الدكتور. محمد عابد الجابري. مركز دراسات الوحدة العربية. الطبعة الثانية. بيروت. اذار. مارس ١٩٩٩ ص ٩٩.

٣٦. هەمان سەرچاوە ص ٧٣.

٣٧. یادەوەرییو زەمەن. ڕەهەند. ژمارە (٦) بەختیار عەلی لا ٣٨.

٣٨. محمد اركون. الاسلام. اوروبا. الغرب. رهانات المعنى وارادات الهيمنة. ترجمة وإسهام. هاشم صالح ص ٢٩.

٣٩. لقد وعدنا نحن وآباؤُنا هذا من قبلُ إن هذا الاساطير الاولين. سورەتی (المؤمنون) ئایەتی (٨٣).

٤٠. مرۆڤ لەڕوانگەی مارکسەوە، ئەریك فروم. وەرگێڕانی بۆ عەرەبی. محمد سيد رصاص. وەرگێڕانی بۆ کوردی. هەنگاو لا (٣٣) ساڵی ١٩٩٩.

٤١. بیروت پوست مودیرنیزم. ئازاد حەمە. بەشی یەکەم. چاپی دووەم. هەولێر لا ١٧٩ ساڵی ٢٠٠٢.

٤٢. هەمان سەرچاوە لا ٧٩.

٤٣. حديث النهايات. فتوحات العولمة ومازق الهوية: على حرب. المركز الثقافي العربي. بيروت. لبنان. ص ٢٠.

٤٤. پاکس ئەمەریکانا (سەردەمی هەیمەنەی ئەمریکی) فاروق ڕەفیق. ٢٠٠٢ لا ٢٠.

٤٥. سێ قۆناغەکەی عەقڵ لە فەلسەفەی (هیگل) دا. گۆڤاری (جەماوەر) ژمارە (٦٩) ساڵی (١٩٩٧) لا ٢٢: عومەر میراودەلی.

٤٦. تكوين العقل العربي:نقد العقل العربي(١): للدكتور محمد عابد الجابري. مركز دراسات الوحدة العربية. ص ١٨.

٤٧. تكوين العقل العربي: نقد العقل العربي(١): الدكتور محمد عابد الجابري. مركز دراسات الوحدة العربية. ص ٢٢.

٤٨. بیری پۆست مۆدێرنیزم: ئازاد حەمە: بەشی یەکەم. چاپی دووەم: هەولێر ٢٠٠٢ لا ٨٦.

٤٩. ئایینداری، لێبووردن، مەدەنیەت. وتووێژ لەگەڵ د. عەبدولکەریم سرووش، گۆڤاری هەژان. ژمارە (٩- ١٠) لا ٣٢.

٥٠. دەربارەی فەلسەفەی ئیسلامو ڕۆشنگەری. (وەڵامێك بۆ كتێبەكەی كاك مەلا بەختیار) لا ٣٢٣. لەبڵاوکراوەکانی نیوەندی ڕەهەند بۆ لێکۆڵینەوەی کوردی ساڵی ٢٠٠٢ نووسینی: مەریوان‌وریا قانیع.

٥١. وەحی‌و ئازادی عەقڵی مرۆڤ. نووسینی محەمەد موجتەهید شەبستەری. وەرگێڕانی:شۆڕش سلێمانیوور. گۆڤاری ژیار: ژمارە (١٠ – ١١) ساڵی ٢٠٠٢ لا ٧٧.

٥٢. المثقفون في الحضارة العربية . د. محمد عابد الجابري مركز دراسات الوحدة العربية. الطبعة الثانية. بيروت. ٢٠٠٠ ص ٤٤.

٥٣. المثقفون في الحضارة العربية. د. محمد عابد الجابري. ص ٤١. مركز دراسات الوحدة العربية. الطبعة الثانية ٢٠٠٠.

٥٤. الاتجاه العقلي في التفسير. د. نصر حامد ابو زيد. الطبعة الثانية ١٩٨٢. دار التنوير للطباعةءالنشر. ص ٣٢.

٥٥. الاتجاه العقلي في التفسير. د. نصر حامد ابوزيد. الطبعة الثانية. ١٩٨٢. دار التنوير للطباعةءالنشر. ص ٢٣ – ٢٤.

٥٦. الاتجاه العقلي في التفسير. د. نصر حامد ابوزيد. الطبعة الثانية. ١٩٨٢. دار التنوير للطباعةءالنشر. ص ٤٧.

٥٧. الاتجاه العقلي في التفسير. د. نصر حامد ابوزيد. الطبعة الثانية، ١٩٨٢، دار التنوير للطباعةءالنشر. ص ٤٥.

٥٨. تكوين العقل العربي. نقد العقل العربي. الدكتور محمد عابد الجابري. مركز دراسات الوحدة العربية. ص ١٥ – ١٦.

٥٩. هەمان سەرچاوە لا ٣٠ – ٣٣.

٦٠. سەرچاوەی پێشوو لا ٧٦ – ٧٧.

٦١. هەمان سەرچاوە لا ٨٧ – ٨٨.

٦٢. عەقڵی کوردیو گۆران: عەلی کەریم محەمەد لا ٤٩. چاپخانەی سیما – سلێمانی. ٢٠٠٣

٦٣. نقدی برقرائت رسمي أزدين. (بحرانها، چالشها، راه حلها ).

سازمان

چاپو انتشارات‌وزارت فرهنگی‌و ارشاد اسلامی. نوبت چاپ. چاپ اول. ١٣٧٩ ص ٣٣١ محمد مجتهد شبستری.

٦٤. گۆڤاری رەهەند. ژمارە (١٢ – ١٣) ساڵی ٢٠٠١ کۆمەڵگاو منداڵە نامۆکانی. . . بەختیار عەلی. لا ٣٩.

٦٥. العقل الاخلاقي العربي. نقد العقل العربي (٤). د. محمد عابد الجابري ص ٢٦١ – ٢٦٦ مركز دراسات الوحدة العربية. الطبعة الاولى. بيروت، اذار / مارس ٢٠٠١.

٦٦. هەمان سەرچاوە ص ١١٠ – ١١٨.

٦٧. هەمان سەرچاوە ص ١٠٢ – ١١٥.

٦٨. العقل الأخلاق العربي. د. محمد عابدالجابري. مركز دراسات الوحدة العربية. الطبعة الأولى. ٢٠٠١ ص ٣٦–٣٩.

٦٩. فەلسەفەی ئاینیو پەروەردە لای کانت. نووسینی د. عەبدولرەحمان بەدەوی، وەرگێڕانی سامان عەلی، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم. لا ٣٦.

٧٠. مەریوانوریا قانیع. دەسەڵاتو جیاوازی. کۆمەڵەوتار. چاپی دووەم ٢٠٠١ لا ٢٢٥

٧١. العقل الأخلاقي العربي (نقد العقل العربي ٤ ). الدكتور محمد عابد الجابري. مركز دراسات الوحدة العربية. الطبعة الأولى. بيروت. أذار– مارس ٢٠٠١ ص٥٥–٥٦

٧٢. هەمان سەرچاوەو لاپەڕە

٧٣. هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٢٥٨–٢٨٠

٧٤. لەو دیو زنجیرەکانیوەهمەوە. ئەریك فرۆم. وەرگێرانی عەبدوڵلاسیوەیلی. ٢٠٠٣سلێمانی. چاپو پەخشی سەردەم. لا١٨٢

٧٥. العقل الأخلاقي العربي (نقد العقل العربي ٤ ). الدكتور محمد عابد الجابري. مركز دراسات الوحدة العربية. الطبعة الأولى. بيروت. أذار– مارس ٢٠٠١ ص ٢٩١–٣٠٠

٧٦. هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٣٤٥–٣٥٢

٧٧. تكوين العقل العربي: نقد العقل العربي(١): الدكتور محمد عابد الجابري. مركز دراسات الوحدة العربية. ص ٢٨–٣٠.

٧٨. دەربارەی فەلسەفەی ئیسلامو ڕۆشنگەری. (وەڵامێك بۆ كتێبەكەی كاك مەلا بەختیار) لا ٢٦١. لەبڵاوكراوەكانی نیوەندی ڕەهەند بۆ لێكۆڵینەوەی كوردی ساڵی ٢٠٠٢ نووسینی: مەریوانوریا قانیع

٧٩. هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٢٥٩

٨٠. أسئلة الحقيقةمرهانات الفكر. علي حرب. دارالطليعة للطباعةوالنشر. بيروت ١٩٩٤ ص ٩